زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

( ١٣ - ١٧ )

# دەستەیەک لە شەهیدان

حبیب محمد سعید



زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

( ١٣ – ١٧ )

# دەستەیەک لە شەهیدان

حبیب محمد سعید

# زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

(١٣ _ ١٧)

## عومەیری کوڕی حومام
## عوبەیدی کوڕی حاریث
## عەبدوڵلای کوڕی عەمر
## سەعدی کوڕی رەبیع
## عەمری کوڕی جەمووح

حبیب محمد سعید

ئازیزەکانم ئەی هاوەڵە شەهیدەکانی پێغەمبەری خـــوا ..

کاتێ کە چمکێ لـە ژیانی هەرکامتان ئامارەزا ئەبم، زیاتر گەورەیی ئیسلامم بۆ دەر ئەکەوێ کەوا بەم شێوە بێ وێنەیە ئێوەی پێ گەیاند و وا خستنیە سەر راستە شەقامی فیداکاری و گیانبەخت‌کردن کە بۆ ئەوە نەبێ زۆر حەیفە ئادەمیزاد خوێنی گەش و گیانی شیرینی لـە دەست بدات ، بۆیە شانازیی پێوە ئەکەم ـ بەپێی توانا ـ ژیانتان پێشکەش بکەم بە موسڵمانان تا هاوار بێت لێیان و بەسیەتی خۆدانان لـە پێناوی هیچدا ئاوڕێ بـە لای سەربەرزیی هەردوو جیهانتانەوە بدەنەوە ، تا بەڵکو خوا شەهیدیتان پێ ببەخشێ ..

# پێشەکیی

**الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد المرسلين وعلى آله وصحبه اجمعين ..**

خوای گەورە ـ جل جلالـه ـ وای بڕیار داوە ئادەمیزاد لە سەر ئەم زەوییە جێگیر کا و فەرمانی داوە بـە سەریا بیپەرستێ .. بۆ ئەمەش کۆمەڵی پێغەمبەرانی بـە درێژایی مێژوو بۆ ناردووە تا فەرمانی خـوا ئاگادار بێ و بزانێ لێپرسینەوەی هەیە ..

جا ئەوانەی خواپێداون ئەکەونە سەر راستە شەقام و هەندێکی تریش دژیان ئەوەستن .. هەموو ڕێگایەك بـە کار دێنن تا واز بێنن و هەر لـە سەر رەوتی کۆن بەردەوام بن .. ئا لێرەدا موسڵمان هەڵویستی خـۆی دیاریی ئەکا ..

سەیر ئەکا بە رواڵەتی دنیایی دەسەڵاتی نیە ..
ناحەزانیش خۆیان سەریان لێ شێواوە و ئەیانەوێ
سەریش لەم بشێوێنن ..

سەیر ئەکا دوو ڕێگا وا لە بەر دەمیا .

یەکەم : بەردەوام‌بوون لە سەر ڕێبازی خواناسیی و شوێن‌کەوتنی فەرمانی خوا لە ژیانا ئینجا خۆدانە دەستی ئەو .. سەرەنجامەکەشی لەوانەیە شەهیدیی بە شوێنەوە بێ و پاداشتەکەشی ڕەزامەندیی خوا و بەهەشت ..

وە دووەم : بەجێ‌هێشتنی لەشکری خواناسیی و پەروەردەی ئایینی خوا و هەڵگەڕانەوە بۆ ناو لەشکری کوفر و بێ‌باوەڕیی لە پێناوی ژیانێکی ئاژەڵیی سووك و ریسوا و بێ‌نرخدا و سەرنانەوە بە سەرشۆڕیی و خەجاڵەتیی و چاوەڕوان‌کردنی ئاگری دۆزەخ ..

لە پاڵ ئەمەدا ئەوانەی دان ئەگرن بە خۆیانا سەرەنجام سەرکەوتن بۆ ئایینی خوا ـ بە کۆمەکیی و پشتیوانیی خوا ـ دێننە کایەوە و بەشێکی زۆر لە ناحەزان و وەچە و بەرەیان و بەشێکی زۆریش لە مرۆڤە بێ‌ئاگاکانی وڵاتە دوورەکان لە ئەنجاما دێنە ڕیزی خواناسانەوە و وەك لە سەرشۆڕیی ئەم جیهانە رزگاریان

ئەبێت ، هەروەهاش لەئاگری دۆزەخ رزگاریان ئەبێت و بە بەهەشت شاد ئەبن ..

بەڵام ئەوانەی هەڵ ئەگەڕێنەوە شاهێدییەکی ناحەقیی ئـەدەن کـەوا :

یەکەم : ئایینی خـوا ئەوەندە نەژیـا ئێمە خۆمـان بکەینە قوربانی .

دووەم : ژیانی قیامەت ئەوەندە باوەڕمان پێی نەبوو تـا ژیانی دنیای لـە بێناوا بەخت کەین ..

سێیەم : ترسمان لـە هەڕەشەی ناحەزان زیاتـر بوو تا لە هەڕەشەی پەروەردگار ..

چوارەم : ژیانی سایـەی نـەفامیی بـە زەلیلیی و سەرشۆڕییەوە بـە لامانەوە بـە نرختر بوو تـا ژیانـی پڕپێزی سایەی ئایینی خوا ..

جا هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ زۆر چاك لەمە گەیشتبوون ـ خوا لێیـان رازیی بێت ـ بۆیە ئەیانزانیی ژیان بۆ ئەوە باشە ، تا

خوا درێژەی پێ داوە ، بە خواناسیی بڕازێتەوە کە ویستی کۆتاییشی پێ بێنێ بە شەهیدیی سەر بنێتەوە ..

ئەوەتا ئیمام عەلیی - خوا لێی رازبی بێت - ئەدا بە گوێی موسڵمانەکانا و تێیان ئەگەیەنێ هیچ شتێ نیە هاونرخیی خوێنی مرۆڤ بکا جگە لە بەهەشت و بـا ئەوانیش بە بەهەشت نەبێ نەی فرۆشن ، کە ئەفەرموێ:

« انه ليس لانفسكم ثمن الا الجنة فلا تبيعوها الا بها » ..

خوا یارمەتییمان بدات لە سەر خواناسیی و بانگ کردنەوەی رۆڵەی موسڵمانەکان و تێکڕای ئادەمیزاد لەو پێناوەدا دان بگرین بە خۆمانا و لە خوای گەورەش داوا بکەین هیدایەتی ئەوانە بدات کە دژی ئیسلام ئەجووڵێنەوە تا بە شکوم ئەوانیش و ئێمەیش لە ئاگری دۆزەخ رزگار بین .. ئامین ..

**١١ی / ذولحەججە / ١٤٠٤**
**٦ی / ئەیلوول / ١٩٨٤**
**سیروان**

زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر
(١٣)

# یەکەم شەهیدی ئەنصار

# عومەیری کوری حومام

حبیب محمد سعید

ئـەم پاڵەوانەمان یەکەم ئەنصاریە کە خوێنی لـە پێناوی ئیسلامدا ڕژا بـێ ..

یەکەم کەس بوو لـە دانیشـتوانی مـەدینە پلەی شەهیدیی وەر بگرێ ..

دیارە خواپێداوە ، وە دیارە شانی هەڵ ئەگـرێ وا ئەم پلە نایابەی دەست کەوێ .. چونکە خوای گەورە خۆی بە چاکیی بەندەی خۆی ئەناسێ و ئەزانێ شـایانی چیـە ..

ئەوانەی قەڵای ئیسلامیان بەرز و پایەدار کـــرد ، ئەوانە خاوەنی ئیمانێکی بێوێنە بوون .. دڵەکانیان زۆر بـە چـاکیی زاخـاو دا بـوو ، پڕیـان کـرد بوو لـە خۆشەویستیی خـوا و پێغەمبەرەکەی ، وە بە ڕووناکیی قورئان ڕۆشنیـان کردبوونەوە .. بۆیـە وا تەمـەنیشیان پیرۆزیی پێ درا بوو و هەموو مەردیی و پیاوەتیەکیان لێ ئەوەشایەوە ..

کورتەکەی بوو بوونە قیامەتویست ، ئیتر باکیان لە زیانی ئەم دنیایە و لەکیس‌چوونی ژیان نەبوو •• بۆیە هەموو خزمەتێکیان لێ ئەهات ••

عومەیری کوڕی حومامیش یەکێکە لەو خاوەن ئیمانە خواناسانە کە خۆشەویستیی و ئیمان دڵیانی داگیر کردبوو ••

ئەوە بوو هەر کە بانگی ئیسلامی بیست خێرا موسڵمان بوو ، وە بووە یەکێ لەو موسڵمانە ئەنصاریانەی کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزا شان بە شانی موسڵمانە موهاجیرە چەوساوەکانی مەککە ناوی بردوون و رەزامەندیی خۆی دەر بڕیوە لێیان و بەهەشتی بەرینی بۆ ئامادە کردوون ، کە ئەفەرموێ :

« والسابقون الاولون من المهاجرين والانصار والذين اتبعوهم باحسان رضي الله عنهم ورضوا عنه واعد لهم جنات تجري تحتها الانهار خالدين فيها ابدا ، ذلك الفوز العظيم » ١٠٠ / التوبة •

دوای ئەوەی موسڵمانەکانی مەککە گەیشتنە

مـەدینە ، پێغەمبـەری خوا ـ صلی اللـە علیە وسـلم ـ عومەیری کوڕی حومـام و عوبەیـدەی کوڕی حاریثی کردە برا ..

ڕۆژ و مانـگ و ساڵ تێ پەڕین ، موسـڵمانەکان خەریـکی خواپـەرستیی بوون .. دەستەی موهاجیر و دەستەی ئەنصار بـە شێوەیەکی بێوێنە ژیانی برایەتییان ئەدایە سـەر .. مێژوو برایەتیی و خۆشەویستیی وای بە خۆیەوە نەدیبوو و نابینێ .. تـا ئەوە بوو جەنگی بـەدر ، جـەنـگی پشت شـکانی ستەمـکاران و دەستدرێژکەران ، جەنگی جیاکردنەوەی ڕەوا و ناڕەوا ، هاتە بەرەوە .. ئەو ڕۆژە هـاتە بەرەوە موسڵمانەکان بیسەلمێنن هیچ هێزێك لە بـەر دەم هێزی خواناسییدا خۆی ناگرێت ..

بـە ڕاستیی سەلماندیان هەر کۆمەڵێ سەر و مـاڵ بفرۆشێ بە خواو بە تەمای پاداشتی قیامەت بێ ، هەرگیز هیچ هێزێکی دنیاپەرست چاری ناکا و ناچارە سەرەنجام ـ زۆری پێ بچێ یـا کەم ـ ملی بۆ کەچ کات ..

جووته برای موسلمان عومەیر و عوبەیدەیش وەك
براكانی تریان خۆیان ئامادە كـرد •• چاویان بڕیبـە
بەهەشت •• لەشكری ئیمان‌دار كەیشتە مەیدانی جەنگ
لـە بەدر ، وە ئەوە بوو یارمەتیی و كۆمەكیەكی خوایی
لـە هـەموو لایەكـەوە بۆ موسـلمانەكان هات •• ئیجا
پێغـەمبەری بەوەفـا ـ صلی اللـه علیه وسـلم ـ بیری
كردەوە ئەنصارەكان پەیمانی ئـەوەیان پـێ داوە لـــە
مەدینـەدا بـەرگریی لـە خۆی و لـە ئاینەكەی بكەن ،
بۆیە پرسی پێ كردن ئایا رایان چۆنە بۆ جەنگەی كە
ئەمان بـە تەمای نەبوون ••

ئەوانیش ـ خوا لێیان رازیی بێت ـ سەر و ماڵیـان
فرۆشتبوو بـە خوا ، بـە پـەروەردەی قورئـانی پیرۆز
تینووی شـەهیدیی بوون •• شـەهیدیی •• بۆیە دڵـی
پێغەمبەریان خۆش كرد و پێیـان راگـەیاند تـا دڵـۆپێ
خوێنیان تیا بمێنێ كۆڵ نـادەن و باكیان لـە سـەختیی و
مەینەت نیە كە لە سەر ئیسلام بێتە رێیان ••

پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ سەرنجی

دا چاریان نیە و ئەبێ لەگەڵ فورڕەیشا بجەنگێن ٠٠ بۆیە نەخشەیەکی رێك و پێکی کێشا بۆ موسڵمانەکان و ئەوسا لە خوا پاڕایەوە بۆ دامەزراندنی کۆمەڵی ئیمان‌دار و سەرخستنی ٠٠ ئیجا کەوتە ئامۆژگاریی و هەڵنانی موسڵمانەکان و خۆشەویست‌کردنی جیهاد و شەهیدیی لە لایان ٠٠ ئەوە بوو سوێندی بۆ خواردن هەر موسڵمانێ بچێت بە ئەژ دوژمناندا و پشت هەڵ نەکا و بە ئارامەوە و لە پێناوی خوادا شەهید ببێ خوا ئەی‌خاتە بەهەشتەوە کە فەرمووی :

« والذي نفسي بيده لا يقاتلهم رجل فيقتل صابرا محتسبا ، مقبلا غير مدبر ، الا أدخله الله الجنة » ٠٠

لە ریواتێکی ترا پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه و سلم ـ بە موسڵمانەکان ئەفەرموێ :

« قوموا الى جنة عرضها السموات والارض » ٠

ئەفەرموێ : هەستن ٠٠ وا دوژمنانی خوا لە بەرامبەرتانا وەستاون ٠٠ هەرکامتان شەهید ببێ بۆ ئەو بەهەشتە ئەچێ کە پانایەکەی ئەوەندەی ئاسمانەکان و

زەویی ئەبێت •• خەمتان نەبێ ، ئەگەر ئەم جیهانە بە جێ بێڵن زیان ناکەن ••

عومەیری کوڕی حومام بــە گوێوە بوو و پرسی : ئەی پێغەمبەری خوا، بەهەشتێك کە پانایییەکەی ئەوەندەی ئاسمانەکان و زەویی بێت ؟

فــەرمووی : بەڵێ ••

بــەڵێنی پڕ لــە بەختــەوەریــی لــە دەمی پیرۆزی سەرکردە و پێشەوای راستەقینە دەرچوو و عومــەیری سەربازی بەوەفاش بیستی •• بە بیستنی ئەم بەڵێنە ، بــە سەرسوڕمانەوە وتی : « بەخ ، بەخ »[1] ••

وتەیەکی بەرز و پاك لە دەمی شەهیدێکی ئیسـلام دەر ئەچێت و بە درێژایی مێژوو هەر دەنگ ئەداتەوە :

کێ بەهەشتی ئەوێ ، زۆر ئاسانە •• هەر ئەوەندەیە

---

(١) لــە ریوایەتێکا ئەڵێ : « بەخ ، بەخ ، ئایا نێوان من و چوونــە بەهەشــتم ئــەوەندە نیــە ئەمانــە بم‌کوژن ؟ » •

بەڵام ئەمە بۆ ئەوانە ئاسانە کە خـوا پێی داون ••
بە دەستی دوژمنانی خوا خوێنی بڕژێ ••
لام و جیم ناکەن •• بیانوو ناگرن ••

بانگی « لا اله الا الله » بەبێباکیی بەرز ئەکەنەوە:
ئەی دروستکراوەکانی خوای گەورە بە شـاهێد بن ئێمە بڕوامان وایە خوای گەورە دروستی کردووین و هەر بۆ ئەوەش بیپەرستین •• بە شاهێد بن وا شوێن ئەو ڕێبازە شیرینە کەوتین •• هێز نیە بتوانێ پەشیمانمان کاتەوە •• دوای ڕەزامەندیی خوا ، بەهەشتمان ئەوێ•• نزیکترین ڕێگای بەهەشتیش شەهیدییە •• دڵمان بۆی ئەگرێ •• با کافـرانیش درێغیی نەکـەن • هەتـا لـە سەرزەوییدا خوێنی موسڵمان لـە سەر خوا بڕژێ ئـەوە تەمامی ئیسلام گەشەدارتر و گەورەتر ئەبێت •• شانازیی پێوە ئەکەین لەو ڕێز و پایەیە خەڵات بکرێین ••

پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ بە گوێیەوە بوو ، کە عومەیر ئەیوت بەخ بەخ ، بۆیە فەرمووی:
چی پاڵت پێوە ئەنێ تا بەخ بەخ بڵێیت ؟

وتی : بە خوا لە بەر هیچ شتێ نیە ئەی پێغەمبەری خـوا ، جگە لەوەی ئاواتەخوازم خوا بمکاتە ئەهلی ئەو بەهەشتە ..

پێغەمبەری خوا ـ صلی اللە علیە وسلم ـ بە فەرمانی خـوا ، لـە زاری شـیرینی شـیرینترین مـژدە بـۆ عومەیر هاتە دەرەوە .. سەیری کرد عومەیر سەربازێکی راستگۆیە و بە راستیی ئاواتی شەهیدیی ئەخوازێ بۆیـە فـەرمووی :

دەی تۆ ئەهلی ئەو بەهەشتەی ..
مژدە بێت ئەگەی بە ئاواتی دڵت ..

مژدە بێت دەست لـە ملی شەهیدیی ئەکەیت و لـە خەڵاتیا ئەگەیتە بەهەشت ..

مژدە بێت هەرکەسێ بـە راستیی گیانی ئامادە بکا بـۆ شەهیدبوون ، خـوا خـەڵاتی ئـەکا و ئـەیخاتە بەهەشتیشەوە ..

ئەمرۆ زیاتر دوژمنان بەرامبەر ئیسلام وەستاون ..

ئیسلامیش ئـەمە تفاقیەتی کـە هـەموو سـەلیقەدارێك ئەیبینێ •• جـا بـا بەراوردی مژدەکەی خۆیان بکەن!!

بەڵێ عومەیری مامۆستا وانەی وتەوە •• خـۆی ئامادە کـرد ئینجا دەستی دایـە جێ بـە جێ کـردنی وانەکەی ، تا بـە کردار بیسەلمێنێ هەر ئەوەندە ئـەو کافرانە بی‌کوژن ئەگاتە بەهەشت ••

بەڵام دەستی گیراوە !!

چی ئەکات ؟!

چەند خورمایەك وا بە دەستیەوە و ئەیان خاتە بەر دڵـی •• لەوانەیە زۆریش برسی بێ ••

جا بەس نیە خورمایشی دەست ئەکەوێ ؟! خـۆ لەشکری کـەم و کەم‌تفاقی مەدینە لـە نـان و خورمـا بەولاوە هیچی تری بێ نەبوو •• بت‌پەرستەکانیش هەموو رۆژێ نۆ یان دە وشتریان سەر ئەبری ••

بیری لـە ئاواتەکەی کردەوە ئەبینێ بەلەیەتـی ، درەنگە بگاتە بەهەشت •• چۆن ئەبێ دوا کەوێ ؟ ئەگەر

خورماکان تەواو کا درەنگی پێ ئەبێ !! ئەگەر خەریکی دنیا بێت لە جیهاد دوا ئەکەوێ !! ئەگەر دڵی بەستریێ بە رابواردنی دنیاوە درەنگ ئەگاتە بەهەشت !!

ئەم تێگەیشتنەی جەنابت ، عومەیری خۆشەویست و بەڕێزم ، لە کوێ و ئەو تێگەیشتنە لە کوێ کە خاوەنەکانی بە تەمان باسی شەهیدیی و جیهاد بە جارێکا بسڕنەوە و بە نوێژ و ڕۆژوویەکی سادەوە بە تەمای پلاو و گۆشت و کۆشك و تەلار مۆدێلاتی سایەی حوکمی نەفامیین •• ئەیانەوێ نەفامیی رازیی کەن و لە پەنای بتەکانا و بە بەڵێ قوربانەوە خواپەرستیی بکەن •• بەڵام ئێوەی بەڕێز سەلمێتان ئیسلام یەك پارچەیە و لەتلەت ناکرێ و جیهاد چڵەپۆپەی ئیسلامە ••

جەنگ گەرم بوو بوو •• تەپ و تۆزی سمی وڵاخەکان بەرز بووبوویەوە ، نەڕەی پاڵەوان و حیلەی ئەسپ و چەخماخەی شمشێرەکان تێکەڵ بووبوون و دیمەنێکی سامناکی خوێناویی ئەهاتە پێش چاو ••

عومەیر دڵی گەرم بوو و وای بە چاك زانی دەست لە چەند دەنکە خورماکەی هەڵ گرێ بۆیە وتی : ئەگەر من بژیم هەتا ئەم خورمایانەم بخۆم بە راستیی ژیانێکی درێژە ..

من بمێنم و خورمـا بخۆم .. بمێنم و دڵ بـە دنیـا خۆش کەم ، کەچی بەهەشت چاوەڕوانم بێت ؟ چەنـد دەنـکە خورمایەك دوام خەن و لەو هەموو ناز و نیعمەتەی بەهەشت دوا کەوم ؟

خورماکانی فڕێ دا و دەستی دایە شمشێرەکەی و لـە کێلان دەری هێنا ، خۆی کرد بە ناو خەڵکەکـەدا و بـە هەموو بارێکا کوشتاری ئەکرد و ئـەم هەڵبەسـتەی دووبارە ئەکردەوە :

رکضـاً الی الله بغیـر زاد
الا التقی وعمـــل المعـاد
والصبر فی‌الله علی الجهاد
وکل زاد عرضـــة للنفاد
غیر التقی والبر والرشاد

بــه سەرنجدانی ئەم هــەڵبەستە لــە تێگەیشــتن و خواناسیی عومەیر ئاگادار ئەبین ..

بەرەو خوای پەروەردگار را ئەکات ، بــەڵام بــێ توێشوو جگە لــە توێشووی شەرمی خوا و خۆپاراستن لە خەشم و قینی ، وە کردەوەی چاکی قیامەت ، وە ئارام و بەرگەگرتن ، لە بەر خوا ، لە جیهادا .. دای ئەنێ تەنها تەقوا و چاکە و دۆزینەوەی رێگای راست شــایانی موسڵمان پێیانەوە خەریك بێ و تەمەنیان لە پێناوا بەخت کا ، چونکە هەموو توێشوویەکی تر لــە تەواو.ووندایە و بــە هەتا هەتایی بۆ خاوەنەکەی نامێنێتەوە ..

ئەمەیە هــەستی موسڵمان بەرامبــەر ژیانی ئــەم دنیایــە .. پێش هەموو شتێك کاری سەرشانی جیهاد و شەهیدیە ..

جــا چونــکە لــە قووڵایی دڵیــا ئامادەی جیهــاد و شەهیدیی بوو ، دەستی دایە کوشتار لــە پێناوی خوادا.. باکی لــە مان و مردن نەبوو .. ئاوڕی بۆ هیچ خۆشیی

و رابواردنێـکی دنیا نەئەدایـەوە ٠٠ بـەرەو شوێنی پڕ مەترسیی ئەکۆشا بۆ ئەوەی بترسێ ، پشت هـەڵ کـا ، تـا بەشـــکوم دەست لـە مل بێ لـەگەڵ شـەهیدیا و مژدەکەی پێغەمبەری پێشەوا - صلی الله علیه وسلم - ، کە پێی دا ، بێتە دیی و بـە بەهەشت شاد بێتەوە ٠٠

هـەروا بەردەوام بوو تـا ئـەوە بوو بـە دەسـتی بتپەرستێك ، کە ناوی خالیدی کوڕی ئەعلەم بوو ، بـە سەری بەرزدوە شەهید کرا و خوا لێی رازیی بێت ، بووە یەکەم شەهیدی ئەنصار[٢] ٠٠

دنیای پڕ لە مەینەتی بە جێ هێشت بۆ ئەوەی منالی لـە دوا بـە جێ بمێنێ ، بەو ئاواتـەوە تـا لەوێ لەگەڵ دەستەی خواناسانا بە خۆشیی و شادمانیی ژیانی بەهەشتی نەبڕاوە بـە سەر بەرن ٠٠ خوا لێیان رازیی بێت ٠٠

---

(٢) لـە هـەندێ ریوایەتا حاریثەی کوڕی سوراقـەی ئەنصاریی یەکەم شەهیدی ئەنصارە ٠٠ « اسـد الغابة - ابن الاثیر » ٠

# (١)

هەر کـە پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئـاڵای خـواپەرسـتی بـەرز کـردەوە و دانیشـتوانی دەوروبەری لـە ئیسلامی بێ گەرد ئاگادار کرد عوبەیدەی کوڕی حاریثیش مەردانە لـە ئاینی خوا هاتە پێشـەوە و بە بیری تیژی هەڵی سەنگاند و بۆی دەرکەوت ئـەمـە ڕێبازی هیدایەت و ڕۆشنایی و سەرفرازییە بۆ هـەردوو ژیـان ، بۆیە هێشتا پێغەمبەری خـوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ نەچووبووە ماڵی ئەرقەمەوە ، شـان بە شـانی ئەبووسـەلەمە[١] و عـەبـدوڵڵای کوڕی ئـەرقەم[٢] و

(١) ئـەبووسـەلـەمـە : ناوی عـەبدوڵڵای کـوڕی عەبدولئەسەدی مەخزوومیی قورەیشییە ، یەکێکە لـەو موسڵمانانەی کـە زوو بە زوو لـە مەککەدا موسڵمان بوو ، برای شیریی پێغەمبەری خوا بوو ، دوای گەڕانەوە لە بەدر بووە ئەمیری ئەو سریەیەی کە پێغەمبەری خوا ناردی بۆ سەر نەوەی ئەسەد تا هێرش نەهێنێتە سەر مەدینە و لە ئەنجاما نەوەی

عوثمانی کــوڕی مەظعوون[٣] ـ خــوا لــە هــەموویان

ئەسەد لە ترسی موسڵمانەکان زایان کرد ٠٠ ئیتر ئەوەندەی پێ نەچوو کۆچی دوایی کرد ٠٠ مێردی ئوم سەلەمە بوو کــە دوای ئەو بووە یەکێ لــە دایکانی ئیمانداران ٠٠

(٢) عەبدوڵلای کوڕی ئەرقەم : لەو موسڵمانانەیە کە زوو موسڵمان بووە ، نووسەری پێغەمبەری خــوا بووە و نامــەی پێ نووسیوە بۆ پاشایان ، زۆر جێگای متمانەی بووە ، بەو بۆنەوە عومەر و عوثمان ـ خوا لێیان رازیی بێت ـ متمانەیان پێ کردووە و کاروباری « بيت المال » یان پێ سپاردووە ، هەتا عوثمان سیی هەزاری ئەداتێ لە جیاتی هەوڵ و زەحمەتی ، ئەویش ـ خوا لێی رازیی بێت ـ گلی ناداتەوە و ئەڵێ : من لــە پێناوی خــوادا کــارم کردووە ٠ لــە سەردەمی عوثمــاندا کۆچی دوایی کردووە ٠٠

(٣) عوثمانی کوڕی مەظعوون : دوای موسڵمانبوونی سیانزە پیــاو موسڵمان بووە ، دوو جــار کۆچی کردووە بۆ حەبەشە ٠٠ لــە سەردەمی نەفامییدا یەکێك بووە لە پیاوە داناکانی عەرەب ٠٠ کاتێ موسڵمان بوو ئەی ویست تەرکی دنیــا بکات و

رازیی بێت ـ ، موسڵمان بوو •

خاوەنی پایە و پلەیەکی بەرز بوو لای پێغەمبەری خـوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ چونکە بـە راستیی و بـە پاکیی دەستی بە ئیسلامەوە گرتبوو ••

موسڵمانـەکان لـە مەککـەدا هـەر چـەندە بێ دەسەڵات بوون ، بەڵام ژیانێکی برایانەیان ئەدایە سەر•• ئیمان و چێژی ئیمان دڵ و دەروونـی پڕ کردبوون •• هەستیان بە هێزێکی یەکجار چارنەکراو ئەکرد •• جـا بۆ ئەوەی زیاتر دامەرراو و کۆڵنەدەر بن ، پێغەمبەری خـوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە نێوان خۆیانا دوو دوو

---

دەسـت بداتـە دنیـا نەویستیی ، بـەڵام پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ماوەی نـەدا •• بەژداریی جـەنگی بـەدری کـردووە •• یەکەم کـەسێکە لـە موهاجیرەکان لـە مەدینەدا مردبێ و یەکەم کەسیش لە گۆڕستانی بەقیعدا ، لە سالی دووەمی کۆچییدا ، نێژراوە •• کە گیانی دەرچوو ، پێغەمبـەری خوا ـ صـلی الله علیـه وسلم ـ بە مردوویی ماچی کرد ••

کردنیە برا تا زیاتر بە دەم یەکتریەوە بن و چاودێریی یەکتریی بکەن ، ئەوە بوو عوبەیدە و بیلالی کردە برا ..

هەرچۆن بوو ماوەی مەککە بە سەر چوو ، هەرچەندە پڕی بوو لە مەینەت و چەرمەسەرێ بۆ موسڵمانە بێتاوانەکان ، بەڵام مەردانە شانیان دایە بەر ئازار و لێدان تا خوا دەرووی لێ کردنەوە ، عوبەیدەیش لەگەڵ هەردوو براکەیا ، طوفەیل[٤] و حوصەین[٥]

(٤) طوفەیلی کوڕی حاریث : بەژداریی جەنگی بەدری کردووە .. وە لەگەڵ حوصەینی برایا لە نێوان سالی سیی و یەك و سیی و سێی کۆچییدا جیهانی بە جێ هێشتووە .. پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیە وسلم ـ لە گەڵ سوفیانی کوڕی قەیسی کوڕی حاریشدا کردنیە برا ..

(٥) حوصەینی کوڕی حاریث : ئەمیش بەژداریی بەدری کردووە .. عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس فەرموویەتی : ئایەتی « ان الذین یتلون کتاب الله واقاموا الصلوة » کە ئایەتی ژمارە (٢٩)ی سوورەتی « فاطر » ە لە بارەی ئەمەوە هاتۆتە خوارەوە ..

کۆچیان کرد بۆ مەدینە و لە پێناوی خوادا و بۆ بەرزکردنەوەی ئالای ئیسلام نیشتمان و کەس و کاریان بە جێ هێشت .. ئینجا پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ عوبەیدەی لەگەڵ عومەیری کوڕی حومامدا کردە برا ، تا هەردووکیان مەردانە قۆڵ هەڵ ماڵن و بەژداریی جەنگی بەدر بکەن و بە قورەیش و بە هەموو ستەمکارانی سەرزەوییی بسەلمێنن کەوا برایەتیی بیروباوەڕ لە ئیسلاما زۆر بەهێزە و ، شێرە بێباکەکانی ئیسلامیش شانازیی بە مەرگەوە ئەکەن لە پێناوی خوادا .. وە ئەو کاتە خۆیان بە خاوەن ڕێز ئەزانن خوێنە گەشەکەیان بڕژێت و نەمامی ئیسلامی خاوەن بەر و بەرهەم پاراو کات ..

موسڵمانەکان لە مەدینە دەستیان دایە ژیانی خواپەرستیی دوور لە ستەم و جەوری قورەیش .. بەڵام وە نەبێ قورەیش کۆڵی دابێ و واز لە موسڵمانەکان بێنێ بێخەم دانیشن ، ئەوە بوو بۆ هەل ئەگەڕا تا ژیان لە موسڵمانەکان تاڵ کا و بە هەر ڕێگایەك بووە چرای

ئایینەکەیان بکوژێننەوە ، بۆیــە موســڵمانەکانیش ناچار بوون بــە هەموو شێوەیــەك زیان بە بەرژەوەندیەکانــی قورەیش بگەیەنن بە تایبەتیی ئەو بازرگانیەی کە بەرەو شام پێی هەڵ ئەسان و قازانجەکەی لە دژی موسڵمانەکان خــەرج ئەکرا ..

ئەوە بوو بە سامانی کاروانە رزگاربووەکەی بەدر جەنگی ئوحود هەڵ گیرسا ، بــەڵام کاتێ موســڵمانەکان هێزیان پەیدا کرد و تەنگیان بە قورەیش و بازرگانیەکەی هەڵ چنی و هەزار کەوتن و گرانیی و برسێتیی دەوردی دان ، کەوتنە پارانەوە لــە پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ تــا لــە بەر خاتری پەیوەندیی خزمایــەتیی فەرمــان بدا بــە ســـەر ثومامەی کوڕی ئوثالدا ـ کــە پاشــایەکــی ناوچــەی یەمامە بوو و کــەوتــە دەســتی موسڵمانان و دوایش بە ویستی خۆی موسڵمان بوو ـ تــا خــواردن و دانــەوێڵــەیان لــێ قــەدەغە نەکات .. دیارە ئەمەش لە پاداشــتی ئــەو هــەموو خزمەتەدا کــە قورەیش لە مەککەدا و پێش کۆچ کــردن بــەرامبەر بــە

موسڵمانەکان پێی هەڵسا !! بەڵام پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ نێرراو و هەڵبژاردەی خوایە ؤ بۆ هیدایەت و بەرزەیی ناردوویەتی ، بۆیە فەرمانی دا بەسەر تومامەدا با ڕێگای خواردن و دانەوێڵە بدات ، ئەویش ڕێگای دا ..

جا بۆ ئەوەی قوڕەیش لە هێز بخرێت ، موسڵمانەکان هەوڵیان ئەدا دەستی لێ بوەشێنن ، بە تایبەتیی لە کاروانە بازرگانیەکانی .. ئەوە بوو دووەم دەوریەی موسڵمانەکان کە بریتیی بوو لە شەست سوار و عوبەیدەی کوڕی حاریث لە لایەن پێغەمبەری خواوە ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمانی بۆ دەر کرا تا ئەمیر بێ و بەرەو دۆڵی « رابغ » بکەوێتە ڕێ . ئەمەش لە مانگی شەووالی ساڵی یەکەمی کۆچیدا بوو .. مەبەست لە ناردنی ئەم دەوریەیە ترساندنی قوڕەیش و بازرگانیەکەی بوو ..

کاتێ موسڵمانەکان گەیشتنە سەر ئاوی « الأحیاء » لە خوارووی ( ثنیة المَرَه ) وە تووشی کاروانێکی

قورەیشــیی بوون کــە دووصــەد جــەنگاوەری لەگەڵا بوو بە سەرکردایەتیی ئەبووسـوفیـانی کـوڕی حەرب • بەڵام جەنگ لـە نێوانیاندا بەرپا نەبوو جگـە لەوەی لە دوورەوە تیریان ئەگرتە یەکتریی ••

لەم بە یەك گەیشتنەدا سەربازخانەی ئیسـلام دوو سەربازی بـە غیرەتی هاتە ناوەوە کە زووتر موسـڵمان بووبوون و بـە ناچاریی لەگـەل لەشـکری مەککـەدا دەرچـوو بوون چونـکە ماوەیان نەبوو کۆچ بکـەن بۆ مەدینە و بگەنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئا لەو بەیەك گەیشتنەدا هـەلیان دەست کـەوت رایان کـردە نـاو موسڵمانەکانـەوە •• ئـەو دووانەش میقدادی کوڕی عەمری بەهرانیی(٦) وعوتبـەی کوڕی

---

(٦) میقدادی کوڕی عەمری مەهرانیی : بـە میقدادی کوڕی ئەسوەدیش ناو ئەبرێت •• میقـداد زۆر زوو موسڵمان بوو •• یەکێ بوو لەوانەی کە کۆچی کرد بۆ حەبەشە و گەڕایەوە بۆ مەککە ، ئینجا بەو شێوەیەی سەرەوە خۆی گەیاندە مەدینە و بەژداریی جەنگی بەدر و هی تریشی کرد • لە مەدینە مایەوە

...ەزوان[7] بوون ـ خوا لێیان رازیی بێت ـ •

...مە عوبەیدە دووەم فەرماندە بوو کە ئاڵای ئیسلام

---

لـە سەردەمی خەلیفە عوثماندا و لـە ساڵی سیی و سێی کۆچیی و لە تەمەنی حەفتا ساڵییدا کۆچی دوایی کرد و هەر لەوێ نێژرا ••

(٧) عوتبەی کوڕی غەزوان : حەوتەمین پیاوێکە کـە موسڵمان بوو بێ •• کۆچی کردووە بۆ حەبەشـە ئینجا گەڕاوەتەوە و بـە هاوەڵیی میقداد کۆچیـان کرد بۆ مەدینە و بەژداریی جەنگی بەدر و بە دواوەی کردووە • خەلیفە عومـەر کاروباری موسڵمانانی دایـە دەست و ئەویش نەخشەی شاری بەصرەی کێشـا و ناوچەی زۆری لە ستەمی خوانەناسیی رزگـار کـرد •• داوای کـرد لـە عومەر تا لـە کاربەدەستێتیی وازی لێ بێنێ ، بەڵام بـە گوێی نەکرد و ئەویش بە ناچاریی گەڕایەوە بۆ بەصرە و لە رێگادا لە خوا پاڕایەوە تا نەی گێڕێتەوە بۆی • زۆر لە مەدینە دوور نەکەوتەوە وشترەکەی گلا و لـە نێوان ساڵی (١٧ ـ ٢٠)ی کۆچییدا و لـە تەمەنی پەنجا و حەوت ساڵییدا جیهانی بە جێ هێشت •

هەڵگرێ بە نیازی جیهادەوە، دوای ئەوەی حەمزە ـ خوا لێی رازی بێت ـ بۆ یەکەمجار ـ ئاڵای جیهادی هەڵ گرت و بووە یەکەم ئەمیرێ کە پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ بینێرێت بۆ دەرەوەی مەدینە ..

## (٢)

ڕۆژان رابوردن تا یەکەم جەنگی ئیسلامیی ـ جەنگی بەدری گەورە ـ هاتە بەرەوە کەوا دروشمی ئەی موسڵمانەکان تیایا بریتیی بوو لە دەربڕینی یەنیایی خوا کە ئەیانوت: احد، احد، ئینجا موسڵمانەکان لە نێوان خۆیانا دروشمی تایبەتیی و خۆیان دا نا بوو بۆ ناسیین و جیاکردنەوە .. ئەوە بوو دروشمی موهاجیرەکان : ئەی نەوەی عەبدوڕڕەحمان و هی خەزرەج : ئەی نەوەی عەبدوڵلا وە هی ئەوس : ئەی نەوەی عوبەیدوڵلا بوو ، وە ئەو ئەسپانەی کە لە جیهادا بەژدار بوون پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ ناوی نان ئەسپی خوا ، ئینجا نزا و پاڕانەوەیەکی زۆری کرد بۆ سەرخستنی موسڵمانەکان و بەم شێوەیە لە خوا نەلاڵایەوە کە ئەی فەرموو : « یا حيّ یا قیوم ، یا حي یا قیوم » ..

لەشکری خوا و لەشکری کوفر بەرامبەر یەك

وەستان ، یەکەم بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵای خوانامیی و چەسپاندنی داد و یەکسانیی لـە سەر زەویدا، دووەمیش بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵای یاخێتیی و سەرکەشیی و بەدنمەکیی لـە بەزدەم پەروەردگارا تـا سەر زەویـی هـەر شەوە زەنگ بێت و مرۆڤایەتیی سەرگەردانی دنیـا و قیامەت بێت ..

لەشکری خوانامـیی هیدایـەتی پـێ بوو ، بـەڵام لەشکری گومرایی مـەلاسی دا بوو بۆ کوژاندنـەوەی رووناکیی خوا لە سەر زەویدا ..

دیارە سەرەنجام هەر بۆ راستیی ئـەبێ .. ناڕەوا خـۆی ماندوو ئەکا .. ئەبێ بـە سەری شۆڕەوە سـەر بنێتـەوە ..

عوبـەیدەی کـوڕی حاریشیش ـ هـەرچەندە پیرترینی سەربازە موسڵمانەکانی بـەدر و لـە تەمـەنی شـەست و سـێ ساڵیدا بوو ـ ئامـادەی ئـەم رۆژە پڕبەختەوریە بوو ..

دوای ئەوەی ئەو قورەیشـیە بتپەرستەی کـە

-ویندی خواردبوو ئەبێ لـە حەوزی موسڵمانەکانا ئاو
-حواتەوە ، یان بیڕووخێنێ وە یا بکوژرێت ، بە دەستی
حەمزە کوژرا ، سێ قوڕەیشیی تر هاتنـە مەیـدانی
جەنگەوە ، کە عوتبەی کوڕی رەبیعە و شەیبەی برای و
وەلیدی کوڕی عوتبە بوون ٠٠ هاتنە مەیدانی موسڵمانەکان
تا زۆرانبازیی و شەڕەشمشێر بکەن ٠٠

عوتبە پیاوێکی دنیادیدە بوو ، لـە سـەر خۆ بوو ، هـەوڵـی زۆری دا تا جـەنـگ روو نەدا و واز لــە موسڵمانەکان بێنن و بگەڕێنەوە ، هەتـا ئامـادە بوو پێی بڵێن عوتبە ترسنۆکی کرد و وازی لە جەنگ هێنا ، بەو مەرجەی جەنگ و کوشتار نەبێ و لە هیچ لایەک خوێن نەڕژێ ٠٠ ئەبووجەهل کە بەمەی زانیی لە عوتبە تووڕە بوو و پێی وت لـە ترسانا ئەوەندە سییەکانت ئاوساون لـە ناو سکتا جێیان نابێتەوە ٠

عوتبە ئەم وتەیەی زۆر بە لاوە قورس بوو بە خۆی و براکەی و کوڕەکـەیەوە پێش هـەموو کـەس هاتنە مەیدان و بە دەنگی بەرز بانگیان کـردە سـەربازخانەی

موسڵمانەکان تا سێ پیاویان بێنە مەیدانی زۆرانبازییەوە..
خێرا لە ریزی موسڵمانەکانەوە سێ گەنجی ئەنصاریی دەر پەڕین و بە پڕتاو بەرەو قورەیشییەکان کەوتنە رێ کە ئەمانە بوون :
عەوفی کوڕی عەفراء[8] و موعەوویذی برای[9] وە عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە[10] ..
هەر سێ قورەیشییەکە لەمەیدانا وەستابوون ..

(8 ، 9) عەوف و موعەوویذ هەردووکیان کوڕی عەفراءن کە خەزرەجیین و لە جەنگی بەدرا شەهید کران ، بەڵام موعەوویذ بەژداریی کوشتنی ئەبووجەهلی کرد ..

(10) عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە : خەزرەجییە و یەکێکە لەوانەی کە زوو موسڵمان بوون ، وە یەکێکە لەو دوانزە نەقیبەی کە سەروکاریی بەستنی پەیمانی عەقەبەی دووەمیان کرد لە مینادا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ـ صلی الله علیه وسلم ـ وە یەکێکە لە وسێ ئەمیرەی کە پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە مانگی جەمادی یەکەمی ساڵی هەشتەمی کۆچییدا هەڵی بژاردن بۆ لەشکری مۆتە تا بچن بە گژ رۆمەکاندا ..

خۆیان ئامادەی نەبەرد کرد بوو •• هەردوو لەشکریش بـە چاوەوە بوون••هەر سێ موسڵمانە خەزرەجیەکەش هاتنە بـەبەر دەمیان •• بە سەری بـەرزەوە وەسـتان •• سەیرێکی یەکتریان کرد •• بتپەرستەکان پرسـیان لـە موسڵمانەکان : ئێوە کێن ؟

ئەمانیش ناو و بنەمانی خۆیان و تیرەکەیـان هـەڵ دا ••

کاتێ زانیان لە دانیشتوانی مەدینەن •• بە رێزەوە پیان وتن : هاوشان و خاوەنڕێزن••بەڵام رازیی نەبوون زۆرانبازیان لەگەڵا بکەن و داوایان لێ کردن بگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانیان و پێیان وتن : ئێمە لـە خزمەکانی خۆمان هاوشانمان ئەوێت •• بەمە هەرسێ ئەنصاریەکە گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان بە بێ کوشتار ••

پێغەمبـەری خوا ـ صلی اللـه علیه وسـلم ـ تـێ گەیشت بت پەرستەکان ئەیانەوێ لەگـەڵ خزمی خۆیانا زۆرانبازیی بکەن ، فەرمانی دەرکرد بۆسی موسڵمان کە بە خزمایەتیی لـە خۆیەوە زۆر نزیك بن ، وە هەروەها بـە خزمایـەتیی بگـەن بـە عوتبە و شـەیبەی برای •• ئەو

سیانەش حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیب و عوبەیدەی کوڕی حاریث و عەلیی کوڕی ئەبوطالیب بوون کە هەموویان لە عەبدمەنافدا ئەگەیشتنەوە بە یەك[11] ..

ئەمانیش ـ خوا لێیان رازیی بێت ـ بە ورجیی هەڵمەتیان دا و گەیشتنە مەیدانی جەنگ و وەك نەڕەشێر لە بەرددەم هەر سێ بتپەرستەکەدا وەستان :

فورتان بە سەر داماوان.. ئەی مێشك بەنجکراوان بە بەنجی نەفامیی و هەرزەیی .. چینان بەزێ ؟ قەڵای ئیسلامتان ئەوێ برووخێنن ؟ خەیاڵتان خاوە .. نەڵایەك خوا فەرمانی بنیاتنانی دەر کردبێ ئێوەی بێ هێز و بێ دەسەڵات چیین ؟

کە زانییان خزمی خۆیانن وتیان: هاوشانن و بەڕێزن.. جا هەریەکەیان یەکێکی هەڵ بژارد تا زۆرانبازیی لە گەڵا

---

(11) عەبدولموطەلیبی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدومەناف . وە عوبەیدەی کوڕی حاریثی کوڕی موطەلیبی کوڕی عەبدمەناف . وە عوتبەی کوڕی رەبیعەی کوڕی عەبدشەمسی کوڕی عەبدمەناف ..

بکات : عەلیی بەرامبەری وەلید وەستا کە هەردووکیان لەوانی تر منداڵتر بوون ، وە حەمزەش بەرامبەری عوتبە وەستا ، عوبەیدەش بەرامبەر شەیبە وەستا کە لەوانی تر بەتەمەن بوون ..

ئەوەندەی پێ نەچوو حەمزە و عەلیی هەریەکەیان نێچیری خۆی کەوڵ کرد و لێ بوویەوە .. بەڵام عوبەیدە و شەیبە هەریەکەیان دەستێکی وەشاند لە بەرامبەرەکەی بە شێوەیەك جووڵەیان لێ بڕا .. خێرا دەست بە جێ شەیبە گیانی دەرچوو و عوبەیدەش بە دەستی شەیبە رانێکی پەڕی بوو و مۆخەکەی لێ ئەهاتە دەرەوە .. خێرا حەمزە و عەلیی عوبەیدەیان بە زامداریی هەڵ گرت و هێنایانەوە بۆ سەربازخانەی موسڵمانەکان و هەر سێ قورەیشییەکەش لە مەیدانی جەنگا بە بێ گیان بە جێ مان و ئەمەش کارێکی گەورەی کردە سەر وورەی هەردوو لەشکرەکە چونکە ئەو سیانە پاڵەوانی بەجەرگ و لێهاتوو و جەنگزان بوون ..

ئەگێڕنەوە لەو کاتەدا کە عوبەیدە بە دەستی شەیبە

رانی ئەبەڕی پارچە هۆنراوەیەك ئەڵێت کە تیایا غیرەت و دەروون فراوانیی و نەبەزرانی موسڵمان دەر ئەکەوێت ، کـە ئەمە واتاکەیەتی :

هەڵوێستێکمان ئەگاتـەوە دانیشـتوانی مـەککە و هەرچی ئەوانەی بێئاگا بوون دا ئەچڵەکێن کـە چۆن عوتبە و شەیبە و وەلید لـە مەیدانی جەنگا خەڵتانی خوێن بوو بوون ، جا ئەگەر ئەوان قاچم ببەڕێنن ، من موسڵمانم و بە هیوام خوا ژیانێکی خۆشم بداتێ لـە بەهەشتا ، تا لەگەڵ حووریەکاندا تیایـا رابوێرم ، بۆیە ئـەم ژیانـە بێنرخەم فرۆشت و کردمە قوربانیی و خوای گـەورە و خاوەن سۆزیش رێزی پێوە نام و بە بەرگی ئیسلام تاوان و خراپەکانی داپۆشییم •• وە نەبێ ئـەو بەیانیەی کـە داوای هاوشانیان کرد پێم ناخۆش بوو بێ کوشتاریان بکەم ، بۆیە هەر سێکمان بە پەلە و وەك شمێری بێباك چووینـە مەیدانیان و لـە پێناوی خوادا دەستمان دایـە کوشتاری یاخی بووان ، تـا ئەوە بوو لـە جێی خۆمانـا پێمان نەجووڵاند هەتا هەر سێکیان گۆڕ کران ••

بەڵێ ، موسڵمان ئەبێ ئەمە هەڵوێستی بێ .. مان و مردنی بە لاوە یەکسان بێ لە پێناوی بیروباوەڕەکەیدا .. وره و غیـرەتـی موسـڵمان لـە کاتی لێقەوماندا دەر ئەکـەوێ .. وە تەنها بـەم ئازایـی و چاوسـەترسییەش موسڵمان ئەتوانێ خزمەتی ئیسلام بکات .

عوبەیدە بە زامداریی هێنرایەوە ناو سەربازخانەی موسـڵمانان .. برایـە خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا .. ئامۆزابەك چەند ساتێك لەش ساغ و تـەندروست بوو ، وا ئێستا لە پێناوی خوادا رانێکی پەڕیوە .. مەرگی زۆر لێوە نزیك بوو .. بەلام پێغەمبەری پێشەوا ـ صلی الله علیه و سلم ـ خاوەنی دەروونێکی فـراوان بوو ، بۆیـە ئەمە نەیپەشۆکاند ، بەڵـکو لـە شوێنەکـەی خۆیـەوە سەروکاریی جەنگی ئەکرد و عوبەیدەی زامداریش لـە تەنیشتیایە ..

عوبەیدە زۆر شادمان بوو بەو خەلاتەی کە دەستی کەوتووە .. شانازیی ئەکرد لـە پێناوی ئیسلامدا و لـە سەر ڕێبازە شیرینەکـەی پێغەمبەر ـ صلی اللـه علیـه

وسلم ـ رانێکی بپەڕێت •• جا بۆ ئەوەی زیاتر فەڕ و پیرۆزیی دەست کەوێ ، بە هەر حاڵ بوو ملی درێژ کرد و خۆی خشاند هەتا کوڵمی خستە سەر پێی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ••

ئەوپەڕی ئاوات بوو پێی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ سەرینی ژێر سەری بێت •• هەموو موسڵمانێکیان هەر بەو تەرزە رێز و خۆشەویستیی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە دڵیا بوو ••

بەڵێ ، عوبەیدە هەر بەودی سەری خستە سەر پێی پێغەمبەری خوا ئەوپەڕی حەسانەوەی بۆ هات •• ئینجا چاوی هەڵ بڕیی بۆ پێغەمبەر و وتی :

ئەی پێغەمبەری خوا ، بەلام بە خوا ئەگەر ئەبووطالیب ئەمڕۆ بمایە ئەیزانی من لەو شایانترم بەوەی کە وتوویەتی :

کذبتم وبیت الله نُبزیْ محمد
ولما نطاعن دونه ونقاتل
ونسلمه حتی نصّرع دونه
ونذهل عن ابنائنا والحلائل

ئەم دوو دێڕە لــە هۆنراوەیەکی درێژدایــە کــە ئەبووطالیبی مامەی پێغەمبەر لە بارەی ستایش و بەرگریی پێغەمبەری خواوە وتبووی ••

روو ئەکاتە ئەو بتپەرستانەی کە هاتبوونە لای تــا پێغەمبەریان بدا بە دەستەوە و بیکوژن و دەنگ و باســی ئاینەکەی ببڕێتەوە ، وە ئەڵێت :

بــە ماڵی خــوا درۆتان کرد ، هــەرگیز موحەممەد ناشکێت و کەس زاڵ نابێ بە سەریا ، وە دەستبەرداری نابین و جەنگ و کوشتار لــە سەری ئەکەین و خۆمــان و منداڵ و خێزانمان لە سەری ئەدەین بە کوشت ••

مەبەستی عوبەیدە ئەوەیە کەوا ئەمڕۆ ئەو بەڵێنەی ئەبووطالیب ، وا ئەم هێنایە دیی و خۆی کردە قەڵغـانی پێغەمبەری خــوا ••

ئینجا عوبەیدە پرسیاری لــە پێغەمبەری خوا کرد :

ئایا من شەهیدم ئەی پێغەمبەری خوا ؟

وەڵامی دایەوە و فەرمووی :

شاهێدیی ئەدەم کە تۆ شەهیدی ••

ئۆخەی کەوتە دڵی عوبەیدەوە ٠٠ مژدەی بەختیاریی وەرگرتووە ٠٠ ئاواتی ژیانی ئەوەیە شەهیدیی دەست کەوێ ، ئیتر مان و نەمان جیاوازییان نیە ٠٠ ئیتر مانی زیادەیە چونکە مەبەست هاتۆتە جێ ٠٠

خۆزگەم بەوانەی ئاوا بە ئاوات ئەگەن ٠٠ بەلام خۆ دیارە ـ قورێ بە سەر ئێمە مانان ـ ئیسلام کردار و نیەتی راستە ، نەك خۆزگە خواستن ٠٠

بە سەرکەوتنی ئیسلام و بەرزبوونەوەی ئالای « لا الـه الا الله » جەنگ کۆتایی هات ٠٠ لەشکری خواناسی سەرکەوتوو بە سەری بەرزەوە و بە دڵی پڕ لە سوپاسەوە گەڕایەوە بەرەو پایتەختی دەوڵەتی قورئان ٠٠

موسڵمانەکان عوبەیدەی زامداریان هەڵ گرت و لەگەڵ خۆیانا هێنایانەوە ، بەڵام بە بۆنەی پەڕینی رانیەوە و خوێن لێ رۆیشتنی لـە رێگادا ، لـە شوێنێکا کە پێیان ئەوت دۆڵی صەفراء[١٢] گیانی سپارد و بەرەو

(١٢) دۆڵی صەفراء ناوی دێیەکە لە لای مەدینەوە ، وە ئەیش لێن دۆڵێکی پڕ لە دارخورما و کشت و کاڵ و

بەهەشت کەوتە رێ •• هەر لەوێ وەستان تا لاشەی پیرۆزیان بە گڵ سپارد •• هەر لەوێ لە سەر قەبرەکەی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - دیسان دووبارەی کردەوە و دایەوە بە گوێی هاوەڵەکانیا کە عوبەیدە بە راستیی شەهیدی ئیسلامە و ئیشاردتی بۆ ئەکرد و ئەیفەرموو :

« شاهێدیی ئەدەم کە تۆ شەهیدی » •

هەر وەکو بفەرموێ : هاوەڵەکانم ، ئێوەش شاهێدیی بدەن کە ئەمە شەهیدی رێبازی قورئانە •• بە راستیی شانازییە بۆ شەهیدێك پێغەمبەری راستگۆ - صلی الله علیه وسلم - شاهێدیی بۆ بدا ، تا هیچ شك و گومانێکی تیا نەمێنێ ••

هەتا ریوایەت کراوە کەوا پێغەمبەری خوا - صلی

---

خێر و بەرەکەت بووە ، وا لە سەر رێگای حاجیان و چەند جارێك پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - پیایا تێ پەڕیوە •• وە قۆناغێك لە بەدرەوە دوورە ••

الله علیه وسلم ـ لەگەڵ لەشکری هاوەڵاندا ـ خوا لێیان رازیی بێت ـ دوای ئەوە جارێکی تر ئەگەنەوە دۆنی صەفراء و لەوێ لا ئەدەن ، هاوەڵان بە سەرسوڕمانەوە ئەڵێن : ئێمە بۆنی میسك ئەبیستین ..

پێغەمبەری ئازیزی پێشەوا سەرسوڕمانەکەیان لا ئەبا کە ئەفەرموێ :

« **وما یمنعکم وها هنا قبر ابي معاوية ؟** » .

بەڵێ هیچ جێگای سەرسوڕمان نیە ، چونکە گۆڕی عوبەیدەی کوڕی حاریث ـ خوا لێی رازیی بێت ـ وا لێرەدا .

هیچ دوور نیە بە لای خواوە سۆز و خۆشەویستیی رژاندبێ بە سەریاو وا ئێوەش بۆنی میسك ببیستن ..

جا ئەمە ئەو فەرمایشتەمان بیر ئەخاتەوە کە پێغەمبەری خوا ـ صلى الله علیه وسلم ـ لە بارەی شەهیدییەوە فەرموویەتی ـ کەوا رەنگی خوێن و بۆنی میسکە لە قیامەتا کە ئەفەرموێ :

**« ••• والذي نفس محمد بيده ما من كلم يكلم في سبيل الله الا جاء يوم القيامة كهيئته حين كلم ، لونه لون دم وريحه مسك ••• » رواه مسلم •**

وه هیچ سەرسووڕمانی ناوێ و بۆ دەسەڵاتی خــوا زۆری پێ ناچێ هەر لەم جیهانەدا ئەو بۆنە خۆشــەی عوبەیدە بدا بە لووتی لەشکری ئیسلامدا تا بە چاوانی خۆیان هەست بکەن ئیسلام لە سەر راستیی وەستاوە و بەڵێنی نا بە جێ بە کەس بگرێ دەسەڵاتی بۆ ئەوانە کار و سەربەرزی هەردووجیهانی ئەکات ••

هەتا ئەوەتا پێشەوامان ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە فەرمایشتی راستی خۆیا دەری بڕیوە کــە پایە و پلەی شەهید ئەوەندە بەرزە بە لای خواوە بۆی هەیە شەفاعەتی حەفتا خزم و کەس و کاری بکا کە ئەفەرموێ :

**« يشــفع الشــهيد في سبعين من أهل بيته » •**

ابو داود والترمذي بسند صحيح •

خوا لــە شەهیدی ئیسلام عوبەیدەی کوڕی حاریث

رازیی بێت و بە نەمریی سەلامی پەروەردگاری لە سەر بێ و خوای گەورە بە رەحمی خۆی دڵەکانی ئێمەش لـە سەر ئیمان راگیر کا و هیدایەتی ئەوانەش بدا کە دوور لـە رێبازی قورئان وەستاون ••

# زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

(١٥)

## عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی حەرام

حبیب محمد سعید

## (١)

دوای بەستنی پەیمانی عەقەبەی یەکەم لـە نێوان پێغەمبەر و دوانزە موسڵمانە ئەنصاریەکاندا ، وە دوای ئەوەی رۆژ بە رۆژا ئازار و سزادانی قورەیش ، بۆ موسڵمانەکان ، لـە پەرەسەندنا بوو ، پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه و سلم ـ موصعەبی کوڕی عومەیری نارد بۆ یەثریب تا بانگی خەڵکە بتپەرستەکەی بکا بۆ سەر رێبازی راستی خواناسیی ..

بـە راستیی موصعەبیش ـ خوا لێی رازیی بێت ـ لـێهاتوو بوو .. بـە دڵێکی پاك و زمانێـکی پاراوەوە فەرمایشتی خوا و پێغـەمبەری گەیـاند بـە دانیشـتوانی شارەکە و ئەوانیش بە چاکیی وەریان گرت ، بە تایبەتیی گەورەترین هۆزی مەدینە ( نەوەی عەبدولئە شهەل ) بە جارێکا لەگەڵ سەعدی کوڕی موعـاذی سـەردارییانا موسڵمان بوون ..

موصعەب دوای نۆ مانگ بە سەری بەرز و روومەتی گەشاوەوە گەڕایەوە مەککە و مژدەی سەرکەوتنی ئیسلامی دا بە پێغەمبەری پێشەوا ـصلی الله علیه وسلمـ، وە لە وەرزی حەجدا ـ ساڵێك دوای بەستنی پەیمانی عەقەبەی یەکەم و دوو ساڵ پێش کۆچ کردنی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ـ، لەگەڵ حەجاجی مەدینەدا ـ کە هێشتا لە سەر بتپەرستیی بوون ـ حەفتا و سێ پیاو و دوو ئافرەتی موسڵمان هاتن بۆ مەککە ..

جا موسڵمانەکانی مەدینە، بۆ ئەوەی کافرانی مەککە و مەدینە پێیان نەزانن، بە نهێنیی پەیوەندیان کرد بە پێغەمبەرەوە و بڕیاری کۆبوونەوەیان بە نهێنیی دا لە شەوی بەستنی پەیمانی عەقەبەی دووەمدا .. بۆیە موسڵمانەکانی مەدینە یەك یەك و دوو دوو خۆیان لە هاوەڵە بت پەرستەکانیان دزییەوە و خۆیان گەیاندە عەقەبە ..

جا هەر چەندە ئەبوایە هیچ بت پەرستێك ئاگادار نەبوایە بەڵام عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی حەرام

ئەبەن لەگەڵ خۆیانا و ئاگاداری ئەکەن ..

عەبدوڵلا سەرداریکی لێهاتوو بوو و پیاوماقووڵی مەدینە بوو ، خاوەنی ریز و پایە بوو بە لای دانیشتوانەوە، بۆیە موسـڵمانـەکان ترسیان لێی نـەبوو و ئاگاداری کۆبوونـەوەکەیـان کـرد ، کـە جگە ئـەو هـەموو ناموسڵمانەکانی تر بێ ئاگا بوون .. موسڵمانەکان رووی تێ ئەکەن و بە نەرم و نیانیی تێی ئەگەیەنن کە ئەو یەکێکە لـە پیاوماقووڵە ناودارەکانیان و پێیان ناخۆشە لـە سـەر بتپەرستیی بمێنێتەوە و لـە دوارۆژیشا بێتە سووتەمەنیی دۆزەخ .. بەم شێوەیە دەست ئەدەنە بانگ کردنی و لە ئەنجاما ئەویش موسڵمان ئەبێ ..

موسڵمانەکان لـە شوێنی پشوودانی خۆیانا ـ لەگەڵ هاورێ بتپەرستەکانیانا ـ ئەخەون و کە سێ یەکی شەو رۆیشت هەڵ ئەسنەوە بـە بێ چرکە خۆیان ئەگەیەنـە عەقەبە تـا بگەنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ ..

بەڵێ ؛ عەبدوڵلای کوڕی عەمر موسڵمان بوو و بـە

دڵێکی پڕ له ئیمانەوه بەڕداریی پەیمانی عەقەبەی دووەمی کـرد و بووه یەکێك لەو دوانزه نەقیبەی که پێغەمبەری خـوا ـ صلی اللـه علیه وسـلم ـ فەرمانی دا به سـەر ئامادەبووانـی پـەیمانەکـەدا تـا دوانـزه سـەرۆك و سەر گەورەی خۆیان هەڵبژێرن بۆ ئەوەی لێ پرسراویان بن و پارێزگاریی بەندەکانی پەیمانەکه بکەن ‧‧ ئەوانیش، بـه بێ دواکەوتن و تەفرەدان و ناکۆکیی ، خێرا هەڵیان بژاردن و جیاکرانەوه و پێغەمبەری خوایش ـ صلی الله علیه وسلم ـ پەیمانی لێ وەرگرتن که فەرمووی :

**« أنتم على قومكـم بمـا فيهـم كفـلاء ، ككفالة الحواريين لعيسى بن مريم ، وأنا كفيل على قومي » ‧**

وتیان : بەڵێ ‧‧

بـه شێوەیەکی ڕێك و پێك پەیمانیان دا به پێغەمبەر و موسڵمانەکان تـا کۆچ بکات بۆ ناویان و بـه سـەر وماڵەوه بەرگریی لـه خۆی و لـه ئاینەکەی بکەن ‧‧

تـا ئەوه بوو یەکەم تاقیکردنەوه هاته بەرەوه ، که جـەنگی بەدری گـەوره بوو عەبدوڵـلایش مـەردانه

بەرداریی تیا کرد و سەلماندی بە راستیی سەربازی بەوەفای ئیسلامە ..

ئینجا بۆ سالی ئایندە جەنگی ئوحود هاتە بەردوە لە رۆژی شەممەی پانزەهەمی مانگی شەووالی سالی سێهەمی کۆچییدا رووی دا ..

هۆی بەرپا بوونی ئەم جەنگە قیز و دەمار و ئارەزووی قورەیشی بوو تا تۆلەی تێك شكانی بەدر و کوژرانی سەرداردکانیان لە موسلمانەکان بسێنن ..

ئەوە بوو بڕیاریان دا ئەو مال و سامانەی کە بە کاروانەکەی ئەبووسوفیان بوو تەرخان بکرێ بۆ جەنگی ئوحود هەلمەت بهێننە سەر مەدینە و دەستێکی گەورە لە موسلمانەکان بووەشێنن ..

موسلمانەکان زۆر وریا بوون ، لەگەل ئەوەشا ورد و سەلیقەدار بوون ، هەوالی هێرشی قورەیش و هاوپەیمانەکانیان ـ کە سێ هەزار کەس ئەبوون ـ کەوتە گوێیان ، بۆیە بە هەموو دەور و بەری شاردا پاسەوانییان دا نا نەوەکو دوژمن لە ناکاوا بدات بە سەریانا وە

موسڵمانەکانیش هەتا لــە کاتی نوێژا خۆیان پێچابوویەوە و چەکیان ئامادە بوو ، وە مەفرەزەیەکیش لە ئەنصارەکان هەڵ بژێرران بۆ پاسەوانیی پێغەمبەری ئازیز ـ صلی الله علیــە وسلم ـ لە ماڵەکەیدا ، کە ئەمانە سـیانیان بوون : سەعدی کوڕی موعاذ و ئوسەیدی کوڕی حوضــەیر و سەعدی کوڕی عوبادە ..

لــە دوای وت و وێژ ، پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ بڕیاری دا موسڵمانەکان لــە شـار دەرچـن ئەوسا لەگەڵ دوژمنا بجەنگێن ، بۆیە لەشکری کرد بــە سێ کەتیبەوە بــەم جۆرە :

(١) کەتیبەی موهاجیرەکان ، کە ئاڵاکەی دا بە دەست موصعەبی کوڕی عومەیرەوە[١] .

---

(١) موصــعەبی کـــوڕی عومــەیر : یــەکێکە لــەو موسڵمانانەی کە زوو بە زوو موسڵمان بوون کــە هێشتا پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ لــە ماڵی ئەرقەمدا بوو ـ واتــە بانگی ئیسلامیی ئاشکرا نەکرا بوو ـ گەنجێکی لاوچاکی پێکەوتوو بوو .. موسڵمان بوونی خۆی لە دایك و خزمەکانی

(٢) کەتیبەی ئەوس لە ئەنصار ، کە ئاڵاکەیَ دا بە دەست حوبابی کوڕی موندیرەوە[٢] .

(٣) کەتیبەی خەزرەج دیسان لە ئەنصار ، کە ئاڵاکەی دا بە دەست ئوسەیدی کوڕی حوضەیردوە[٣] .

---

ئەشاردەوە ،جا کاتێ پێیان زاینی دەست و پێیان بەست و لە ماڵەوە بە بەندکراویی مایەوە هەتا لە دەستیان خۆی داماڵیی و لەگەڵ کۆچکەراندا کۆچی کرد بۆ حەبەشە ·· هەردوو کۆچەکەی کردووە و ،امۆستای مەدینەیە بۆ بانگکردنیان بۆ سەر ئیسلام ·· ئامادەی جەنگی بەدر بوو و لە جەنگی ئوحودا شەهید بوو ··

(٢) حوبابی کوڕی موندیر : ئەنصارییە و لە هۆزی خەزرەجە ·· تەمەنی لە پەنجا ساڵیی تێپەڕی کرد بوو و لە سەردەمی خەلافەتی عومەردا ئەم جیهانەی بە جێ هێشت ··

(٣) ئوسەیدی کوڕی حوضەیر : ئەنصارییە و لە هۆزی ئەوس و نەوەی عەبدولئەشهەلە ·· یەکێکە لەوانەی کە زوو هاتن بە دەم بانگی موصعەبی کوڕی عومەیرەوە ·· یەکێکە لە نەقیبەکانی پەیمانی

لەشکری موسڵمانەکان لە دوای گەڕانەوەی مونافیقەکان بریتیی بوو لە حەوتصەد سەرباز ..

لەو ڕۆژەدا عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرامیش هەستی بە مەترسیی و سامناکیی هەڵویستەکە کرد ، وە هەستی کرد کە دوژمن بە دەسەڵاتە و پێویستە موسڵمانەکان غیرەتیان بخەنە کار ، بۆیە خۆی ئامادە کرد و بڕیاری دا پیاوانە هەڵمەت بەرێ و مان و نەمانی لە پێناوی ئیسلاما لا یەکسان بێت ..

---

عەقەبەی دووەم .. پیاوێکی دەمڕاست و وتەبیستراو بوو لە ناو ئەنصارەکانا .. خاتوو عائیشەی دایکی ئیمانداران ـ خوا لێی رازیی بێت ـ ئەفەرموێ : لە ناو ئەنصاردا سێ پیاو هەن لە فەضل و چاکەدا کەسیان ناگاتێ و هەموشیان لە نەوەی عەبدولئەشهەلن : سەعدی کوڕی موعاذ و ئوسەیدی کوڕی حوضەیر و عەببادی کوڕی بیشر ..

یەکێك بوو لە سەربازە دامەزراوەکانی جەنگی ئوحود و لە حەوت لادا زامدار بوو .. لە سالی بیست و یەکەمی کۆچییدا ئەم جیهانەی بە جێ هێشت ..

عەبدوڵڵا لە ماڵەوە حەوت کچی هەبوون ، بیری
[illegible]ردەوە ناچارە جابیری[4] کوڕی بە لای کچەکانەوە
[illegible]ە جێ بێڵێ .. بۆیە ئامۆژگاریی کرد تا خۆی بچێ بۆ
جیهاد و ئەویش لە ماڵەوە بێ و سەرو کاریی خوشکەکانی
[illegible]ات .. پێی وت :
« جابیر ، هیچت لە سەر نیە ، تۆش وەك دانیشتوانی

---

(٤) جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ئەنصارییە و لـە نەوەی سەلیمەیە ، هاوەڵێکی پایەدارە .. لە نۆزدە جەنگی ئیسلامییدا بەژداریی کردووە ، بـەڵام بـەژداریی بەدری نەکردووە و وا دەر ئەکەوێ باوکی فەرمانی بە سەرا دا بێ ، وەك لە ئوحودا .. فەرموودەی زۆری گێڕاوەتەوە هـەتا مامۆستایانی فـەرموودە (١٥٤٠) فەرموودەی پێغەمبەریان ـ صلی الله علیه وسلم ـ لێ گێڕاوەتەوە .. خاوەنی زانیارییەکی فراوان بووە و لە مزگەوتی پێغەمبەرا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەڵقەی وەرگرتنی زانیاریی هەبووە .. دوا هاوەڵ بووە لە مەدینەدا کۆچی دوایی بکات .. لـە تەمەنی نەوەد و چوار ساڵییدا لـە ساڵی حەفتاو چواری کۆچییدا ئـەم جیهانـەی بـە جێ هێشتووە ..

مەدینە چاوەڕوانیی بکەیت بزانی سەرەنجاممان بە چی ئەگات ، خۆ من بە خوا لە بەر ئەو کچانە نەبێت کـە لـە ماڵەکەدا بـە تەنیا بە جێیان دێڵم پێم خۆشە لە بەر دەستما بکوژرێیت » .

وە وتی :

« کوڕەکـەم .. لام روونـە یەکـەم کەس مـن ئەکوژرێم ، وە بە خوا دوای خۆم کەسێ بە جێ ناهێڵـم بـە لامەوە خۆشەویست تر بێت لە تۆ جگە لە پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ جا بە لای خوشکەکانتەوە دانیشە و ئەرزیشم وا بە سەرەوە بیدەرەوە و ئامۆژگاریی خوشکەکانت لـە سەر چاکە بکە » .

ئەگەر لە بەر چاودێریی کچەکان نەبێت ، دڵم وای پێ خۆشە لە بەر دەستی پێغەمبەری خوادا ـ صلی اللـه علیه وسـلم ـ سـەرباز بیت و خۆت بکـەیتە قوربانـی رێبازەکەی .. وا لام شانازییە لە بەر دەستما بە شەهیدیی سـەر بنێیتەوە ..

ئەمە تەگبیری موسڵمانێکە کە بە تەمای بەهەشتە ..

خۆی بۆ شەهیدیی ئامادە کردووە .. لە کاتێکا کە قەرزارە ، قەرزەکەشی دیارە زۆرە ، ئاواتیش ئەخوازێ لە توانایا بوایە کوڕە تاقانەکەشی بیتوانیایە بێ بۆ جیهاد و لە بەر دەستیا بە شەهیدیی ببینیایە ..

ئەمەیە هەڵوێستی موسڵمان ..

ئیسلام بە کەس دەستکاریی ناکرێ ..

شەرەف و شانازیی موسڵمان شەهیدیە ..

جا ئەم روحە نەبەزە لە هەر کۆمەڵێکی ئیمانداردا پەروەردە بوو ، ئەوا موسڵمانەکان سەربەرزیی دنیا و ...یامەتیان دەست ئەکەوێ ..

ئەوە بوو عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی سەرۆکی نیفاق ...ێ بەکی لەشکری موسڵمانەکانی بڕ دا و بەرەو شار ...گەڕایەوە گوایا لە داخی ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ بە گوێی ئەوی نەکردووە لە کاتی ...وت و وێژدا تا موسڵمانەکان لە ناو شارا بمێننەوە بەڵکو ...ە گوێی گەنجەکانی کردووە ، بەمە سێ صەد مونافیقی

دڵنەخۆش گەڕانەوە و خۆیان لە لەشکری موسڵمانەکان دزیەوە ..

ئەم کاتەدا عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی حەرام کەوتە شوێنیان و کەوتە ئامۆژگاریی و بانگ‌لێ‌کردنیان تـا بە نازی خزمایەتییەوە خوایان بیر بخاتەوە و نەکەن پشت لە پێغەمبەری خوا هەڵ کەن .. کاتێ کە دوژمنی چەکدار دژیان وەستا بێ شـوورەیە دەسـت بەرداری غیرەت و جوامێریی خۆیان بن و لە جەنگ هەڵێن ..

ئەوانیش کە مەبەستیان خـۆدزینەوە و خۆداڕنین بوو ، وتیان : ئەگەر بزانین ئەجەنگێن دەستتان لێ هەڵ ناگرین و پشتتان بەر نادەین ، بەلام ئێمە باوەڕ ناکـەین جەنگ رو بدات ..

کـە ئـەم هەر بانگی لێ کردن و ئەوان لـە ممەو گەڕانەوە سوور بوون ، دەستی لێ شۆرین و وتی :

خـوا دوورتان خاتەوە ئەی دوژمنانی خوا ، خوای گەورە خۆی پشتیوانیی پێغەمبەرەکەی ئەکات تا پێویستبی بـە ئێوە نەمێنێ ..

جەنگ گەرم بوو و عەبدوڵلا بە شەهیدیی سەری
نایەوە .. خوێنە گەشەکەی دەر و دەشتی ئوحودی
سوور کرد و کوڕی تاقانەی جگەر گۆشە و چەند
کچێکی بێ نازی بە جێ هێشت ..

بەڵام نا ، هەر کۆمەڵێ لە سایەی قورئاندا ژیان
بداتە سەر ، نە هەست بە تاقانەیی ئەکات وە نە بە
بێنازیی .. کۆمەڵی ئیماندار یەك لاشەیە و پێکەوە
ئەژی و پێکەوە ئەمرێ ..

جەنگی ئوحود کۆتایی هات بە بەڵێنێك کە
موسڵمانەکان و قورەیش دایان بە یەك ئەویش ئەوە
بوو ساڵێکی تر و لەو رۆژەدا لە بەردا یەکتر ببینن و
بچن بە گژ یەکتریدا ..

قورەیش هەرچەندە دەستی لە موسڵمانەکان
وەشاند و هەلی بە دەست هێنا تا حەفتایان لێ شەهید بکا ،
بەڵام هەر ترس و لەرز لە دڵیا بوو ، بۆیە مەیدانی جەنگی
خێرا بە جێ هێڵا و هەر ئەو ئێوارەیە کشایە دواوە ..
موسڵمانەکان لاشەی شەهیدەکانیان کۆ کردەوە ..

وه هەندێکیان لاشەکانیان هێنانەوە تا لە مەدینەدا بیان نێژن ، بەڵام پێغەمبەری خوا ـ صلى الله علیه وسلم ـ نێرراوێکی نارد تا فەرمانیان بە سەرا بدا لاشەکانیان بێننەوە بۆ شوێنی شەهیدبوونیان ..

جابیری کوڕی عەبدوڵلایش لەگەڵ خوشکەکانیا هەواڵی شەهیدبوونی باوکیان ئەبیستن .. خوشکەکانی ئەی نێرن تا لاشەکەی بخاتە سەر پشتی وشترێك و و بیهێنێتەوە و لە گورستانی نەوەی سەلیمەدا بینێژێ ..

جابیر لەگەڵ خەڵکیی ترا دێت و سەیر ئەکا وا پووری ـ کە ناوی هیندی کچی عەمری کوڕی حەرامە ـ عەبدوڵلای کوڕی عەمری برای و عەمری کوڕی جەمووحی مێردی و خەللادی کوڕی خستوونەتە سەر پشتی وشترێك و هێنانیەوە بۆ مەدینە بە نیازی ئەوەوە لە گۆڕستانەکەی خۆیانا بیان‌نێژن .. لەو کاتەدا پیاوێك جاڕی دا کەوا پێغەمبەری خوا ـ صلى الله علیه وسلم ـ فەرمانتان بە سەرا ئەدا کەوا شەهیدەکان بگێڕنەوە و لە شوێنی شەهیدبوونیانا بیان نێژن .. ئەوانیش ـ خوا لێیان

رازیی بێت ـ بە گوێی فەرمانەکەیان کرد و گەڕاندنیانەوە
سا لەوێ بیان نێژن ..

کۆمەڵی ئیماندار هەمووی وزە و لێهاتنە ..
ئافرەتێ بە تەنیا لاشەی سێ شەهید ئەخاتە سەر پشتی
وشتر و باریان ئەکات و ئەیان هێنێتەوە بۆ شار .. بەڵێ
شار هەمووی وروژاوە و هەموو کەسێ خەریکی لاشەی
خزم و کەسی خۆیەتی ، بەڵام بە راستیی غیرەتە ..
لاشەی براکەی و مێردەکەی و کوڕەکەی بار ئەکا و
ئەیهێنێتەوە ..

ئوم عامیری ئەشهەلیش مێردەکەی و براکەی و
باوکی شەهید بوو بوون .. کاتێ هەواڵیان دایێ ، خوا
لێی رازیی بێت ، وتی :

« **انا لله وانا اليه راجعون** » .

**ئینجا پرسیی : ئەی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله**
علیه وسلم ـ چۆنە ؟ وتیان : چاکە ئەی دایکی عامیر ،
سوپاس بۆ خوا بەو شێوەیە کە تۆ پێت خۆشە ..

وتی : پیشانم بدەن ، تا سەیری کەم ••

کە پێغەمبەری خوایان ـ صلی اللە علیە وسلم ـ بۆ دەست نیشان کرد و چاوی پێ کەوت ساغ و سەلامەت بوو ، وتی : هەموو لێقەوەمانێك ئاسانە ، بەمەرجێ تۆ سەلامەت بی ، ئەی پێغەمبەری خوا ••

پێغەمبەری خوایش ـ صلی اللە علیە وسلم ـ بە چاکیی لە خوا پاڕایەوە بۆی ••

بەڵێ لە کاتێکی زۆر ناسکدا ، لە کاتی شەهید بوونی باوك و برا و مێردا ـ بە یەك جار و لە یەك ڕۆژدا ـ ئافرەتی موسڵمان ئەی‌سەلمێنێ خۆش‌ویستنی خوا و پێغەمبەر یەکەم خۆشەویستییە کە کرۆکی دڵی گرتبێ •• وە ئامادەیە هەموو ژیان بکاتە قوربانی بیروباوەڕەکەی ••

بەر لە ناشتنی لاشەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ، جابیری کوڕی ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ :

باوکمیان هێنایە بەردەمی پێغەمبەری خوا ـ صلی اللە علیە وسلم ـ دوای ئەوەی بت‌پەرستەکان لووت و

'ونیان بڕی بوو و لە بەر دەستی پێغەمبەردا دایان نـا ،
ـووم دەم و چاوی هـەڵ بدەمـەوە و بۆی ئـەگریام
خرمەکانم نەیان ئەهێشت تـا نەیبینم ، بەڵام پێغەمبەر ـ
صلی اللە علیە وسلم ـ قەدەغەی نەئەکردم ..

پێغەمبەر ـ صلی اللە علیە وسلم ـ گوێی لە دەنگی
ئافرەتێك بوو کە وترا کچی یان خوشـکی عـەمرە ..
فەرموی : بۆ ئەگری ؟ وەیان مەگری ! لەو کاتەوە کـە
شەهید بووە فریشتەکان بە باڵەکانیان سێبەری بۆ ئەکەن
تا بەرزتان کردوە بۆ ناشتن ..

خەمی چیتە ؟ شەهیدی ئیسلام خوا چاودێـریـی
ئەکات وە ڕێزی لێوە ئەنێ .. خۆی پاسەوان و خزمەت
گوزاری بۆ تەرخان ئەکا ، چونـکە خوێنی گـەشی بـە
قوربانی ڕێبازی ڕاستیی کردووە ..

کە شەهیدەکان کۆ کـرانەوە و پێغەمبەری خوا ـ
صلی اللـە علیە وسلم ـ لـە سـەر سـەریـان ڕاوەستا ،
فەرمووی :

منێ لە سەر ئەمانە شاهێدم کەوا هـەر کەسـێ لـە

پێناوی خوادا زامدار بکرێت ، ڕۆژی قیامەت خـوا
گەوره بـە شێوەیەك زیندووی ئەکاتەوه کەوا زامەکەی
خوێنی لێ ئەڕوا کە ڕەنگی خوێن و بۆنـی میسـکە .
سەیری ئەم شەهیدانە بکەن بزانن کامیان قورئانی زیاتری
لـە بەرە بیکەنە ئیمامی هاوەڵەکانی لـە گۆڕەکەیانا ..
ئەوە بوو هەر گۆڕێك دوو یان سێ شەهیدیان تیـ
ئەناشت ..

لەو کاتەدا کە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ
فەرمانی بـە ناشتنیان دا ، فەرمووی :

سـەیر کـەن عـەمری کـوڕی جـەمووح(٥) و

---

(٥) عەمری کوڕی جەموح : ئەنصارییە و لە تیرەی بەنی سەلیمەیە .. سەردارێکە لـە سەردارەکانی ئەنصار . ئەڵێن : عەمر دوا ئەنصاریی بووه کـە موسلمان بووه .. خاوەنی ڕێز و پایە بووه لـە نـاو خزمەکانیـا و بـە دەستگوشـادیی و سـنگفراوانیی ناوبانگـی دەر کـردووه .. ئەندازەیەکی زۆر شەل بووه .. هەر چۆن ئـەکا

ﻋەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرام بدۆزنەوە ،
بو کە لە دنیادا هاوڵتییان بە دڵی پاکەوە کردووە لە
ەك گۆڕدا پێکەوە بیان نێژن ٠٠

ﻫەزاران سەلام لە سەر گیانی پاکتان ئەی
ﺷەهیدانی ڕێگای ئیسلام ٠٠ تا لە جیهاندا بوون بە
ی پاکەوە خزمەتی ئیسلامتان ئەکرد ٠٠ کە بە سەری
ﺑەرزەوە شەهیدیش بوون دە با لاشە نەمرە پاکەکەتان
لە شۆرینی ناوێ و هەر بە جلە خوێناویەکانتانەوە
پێکەوە جووت بن و لە یەك جیا نەبنەوە تا بە یەکجاریی
و بە هەتا هەتایی لە بەهەشتا دەست لە ملی یەك کەن ٠٠

---

کۆل بە کوڕەکانی ئەدا تا وازی لێ بێنن و بێڵن
بەژداریی جەنگی ئوحود بکا تا بەشکوم خوا
شەهیدیی خەڵات کات ٠٠

## (٢)

لـه رۆژی ئوحودا جابیر لـه ماڵـەوه مـایەوه
سەروکاریی کردنی خوشـکەکانی ، بـەڵام باوکی ب
شەهیدیی سەری نایەوه •• بـه ئاواتی خۆی گەیشت
چونکه بۆ شەهیدیی ئەکۆشا و خوای گەورەش بە تیاو
ئەزانی ، پێشکەشی بکا ••

جابیر سوپاسـی خـوای کـرد کـه باوکی بـ
سەربەرزییه ، بـه بەهەشتی بەرین ، بە رەزامەندیـ
پەروەردگار ، گەیشت •• بۆیـه زۆر شادمان بوو بـه
مژدەیەی که پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم
پێی دا••مژدەی پێ دا کەوا خوای گەورە باوکی جابیر
زیندوو کردۆتەوه و لـه بەر دەستیا دای ناوه و فەرمان
بـه سەرا داوه ئاوات بخوازێت •• چـی ئەوێت داوا ب
تـا خوای گەورە لـه بەخششی کۆتایی نەهاتووی خۆ

بەشی بدا •• خوای گەورە ، ویست و خواست ئەداتـە دەست بەندەی شەهیدی تا هەرچی ئەوێ داوای بکات••

عەبدوڵڵای شەهید خوا بێداو بوو ، لە ناو هەموو ئادەمیزاددا خوای گەورە هەڵـی بژێرێ و راسـتەوخۆ فەرمایشتی لەگەڵا بکات •• بەندەیەك ئەوەندە خاوەنی ڕێز بێـت بـە لای پـەروەردگارەوە ، ئـەبێ چ ناز و نیعمەتێکی بەهەشتی پێ بەخشرا بێ ؟ •

جا کـە ئـەو ، ئـەو هەموو ناز و نیعمەتـەی پێ بەخشرابێ داوای چی بکا لە خوا ؟

بەندەی موسـڵمانـی دڵ پڕ لـە ئیمان ، شـیاوە وا گەیشتووە بەو پایە بەرزە بۆیە لە وەڵاما وتی :

خوای پەروەردگارم ، ئـەو خواپەرسـتیەی کـە شایانت بێت و من پێی هەڵسم بە جێم نەهێناوە••ئارەزووم نەشکاوە لە پەرسـتنت لە گوێڕایـەڵیی و ملکـەچیی فەرمانەکانت ، لێت ئەخوازم بمگێڕیتـەوە بۆ دونیـا تـا جارێکی تر لـە خزمەتی پێغەمبەری پێشـــەوادا ـ صلی اللـه علیه وسلم ـ بچمەوە جەنگی دوژمنان و جارێکی

تر لـه پێناوی تۆدا شەهید بکرێمەوە ..

خوایە جارێك کەمە لە پێناوی تۆدا خوێنم ڕژاوە ، داوات لێ ئەکەم زیندووم بکەرەوە تا جارێکی تر ئـەو ڕێز و بەختەوەریەم دەست کەوێتەوە .. تا جارێکی تر و ئەوەندەی تر بەخششی بەهەشتم پێ بدەیت ، خوایە..

خوای گەورەش بۆی روون کردەوە کەوا بڕیاری لـە سـەر دراوە : هەر کەس ئەم جیهانەی بە جێ هێشت بۆی ناگەڕێتەوە(٦) ..

---

(٦) لە ریوایەتێکی ترا : پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ سەیری جـابیری کـوڕی عەبدوللا ئەکات و ئەفەرموێ : بۆچ وا بە خەمبـار و دل شکست ئەت بینم ؟
ئەڵێ : ئەی پێغەمبەری خوا ، باوکم شەهید بوو و قەرزێکی زۆر و خێزانێکی گـەورەی بـە سـەرەوە بەجێ هێشتم .. فەرمووی :
ئـەی هەواڵت نەدەمێ کەوا خوای گەورە لەگـەل هیچ کەسا فەرمایشتی نەکردووە مەگەر لە پشتی پەردەوە ، کەچی بێ پەردە و روو بە روو لەگەل باوکتا فەرمایشتی کرد و فەرمووی :

ئەنەسی کوڕی مالیك ـ خوا لێی رازیی بێت ـ لـە پێغەمبەری خواوە ـ صلى الله عليه وسـلم ـ ئەگێڕێنەوە کـە فەرموویـە :

**« ما من عبد يموت له عند الله خير ، يسره أن يرجع الى الدنيا وأن له الدنيا وما فيها الا الشهيد لما يرى من فضل الشهادة فانه يسره أن يرجع الى الدنيا فيقتل مرة اخرى » . رواه الخمسة ..**

ئەفەرموێ هیچ بەندەیەك نیە بمرێ و بە لای خواوە چاکـە و پاداشـتێکی دەسـت کـەوێ ، پێی خۆش بی

---

ئەی بەندەکەم داوام لێ بکە تا پێت ببەخشم ..
وتی : خوایە داوات لێ ئەکەم بمگێریتەوە بۆ دونیا تا جارێکی تر لـە پێنـاوتا بکوژرێمـەوە ..
فەرمووی : بڕیارم داوە هیچ کەس ناگێڕرێتەوە بۆی و ناگەڕێنەوە ..

وتی : خوایـە ، ئەمە بگەیەنە بەوانەی وان بـە دوامەوە ـ واتە ئەوانەی کە زیندوون ـ .. خوای گەورەش ئەم ئایەتە پیرۆزەی ناردە خوارەوە :
**« ولا تحسبن الذين قتلوا في سبيل الله أمواتا بل أحياء ... » .**

بگەڕێتەوە بۆ دونیا هەتا ئەگەر دونیا و هەرچی تیایە هی ئەو بێت جگە لـە شەهید ، لە بەر ئەو هەموو ڕێزەی کە بـە پلەی شەهیدیی بەخشراوە • جا شەهید پێی سـەر بنێتـەوە ••

وە لـە ریوایەتێکی ترا ئەفەرموێ :

**« ما من أحد يدخل الجنة يحب ان يرجع الى الدنيا وان له ما على الارض من شيء غير الشهيد فانه يتمنى ان يرجع فيقتل عشر مرات لما يرى من الكرامة » •**

ئەفەرموێ : هیچ کەسێك نیە بچێتە بەهەشـتەوە و حەز بکا بگەڕێتەوە بۆ دونیا هەتا ئەگەر هـەرچی وا بـە سەر زەویەوە هی ئەو بێت جگە لە شەهید ، تەنها ئـەو ئاوات ئەخوازێ بگەڕێتەوە تا دە جـاری تر لـە پێناوی خوادا شەهید ببێتەوە ، لە بەر ئەو هەموو ڕێزەی کە پێی ئەدرێ ••

بەڵێ شـەهیدان ، کە لە پێناوی ئیسـلامدا سـەر ئەنێنەوە و سەری ئیسلام و موسڵمانەکان بەرز ئەکەنەوە، نەك هەر پەشیمان نین ، بەڵکو بە ئاوات گـەیشـتوون ،

بەلام ئەوەندە خاوەن ریزن ئامادەن تا دە جار بکەرینەوە و لە پیناوی خوادا شەهید بکرینەوە ..

کوان هەلگرانی قورئان ؟

خەمی ژیانی دنیایانە ؟ خەمی مال و منال و خزم و کەس و کار و کاسپی و خانوو بەرە و باغ و باغاتیانە ؟

باوەر ناکەم هەلگری راستەقینەی قورئان خەمی ئەم ژیانە بخوات ..

ئەوە ئیمەی تینەگەیشتووین ئەمانەوی ئیسلامی ئازیز و رزگارکەر بخەینە قالبیکەوە تا طاغووت لیمان رازیی بیت ..

زور بە داخەوەم بو ئەو هەلویستەی کە موسلمانەکانی ئەم دواوەی تیا بوو بەرامبەر بە هیرشی سەرباز و بیروباوەری کافران .. زور حەیفیان کرد جیهاد و شەهیدیان خستە ئەو لاوە تا پاروویە نانی ژیرچەپوکییان دەست کەوی و لە ئەنجامیشا کور و کچەکانیان بەرەو نادیی و سەیرانگا و سینەما و قەراغ رووبارەکان بدرینە بەر ..

بە مژدەکەی پیغەمبەر ـ صلی اللـه علیه وسلم ـ

دڵـی جابیر حەسایەوە •• سوپاسی خوای کرد وا باوکی بەو پلە بەرزە گەیشت ••

لەشـکری موسـڵمانەکان حەودەصـەد کەس بوو حەفتایان شەهید و صـەد و پەنجایان زامـدار بوون •• بەو هەموو ماندووبوونەوە و بەو هەموو خوێن و زامەوە لاشەی شەهیدان بە گڵ سپێررا ••

موسڵمانەکان سەرنجیان دا ، ئەو قورەیشەی کـە ماوەیەکی کەم ــ بە هۆی هەڵەی تیراندازەکانەوە ــ هەلی بـە دەست هێنـا و دەستی خـۆی وەشـاند ، وا باوە کە سەرکەوتبێ و موسڵمانەکانی بەزاندبێ •• لەشکری بتپەرسـت چۆن ئەبێ بە سـەرکەوتوو و لەشـکری خواناسیش بـە بەزراو بدرێنە قەڵەم ؟

چۆن ئەبێ دوژمنانی دەر و ناوی مەدینە موسڵمانەکان بە بێ هێز بزانن ؟ بۆیە دوای تەواو بوونی جەنگی ئوحود

بـه پانزه سـەعات ، پێغەمبەری خوا ـ صلی اللـه علیـه وسلم ـ فەرمانی دا بە لەشکری موسڵمانەکان تـا خۆیان بپێچنەوە و بکەونە سەر لەشکری قورەیش و راوی بنێن، بـەو مەرجـەی تەنها ئەوانـە هـەڵمەت بەرن کە دوێنێ بەژداری جەنگ بوون •• هـەرچی ئامادە نـەبووە بـا نەیەت •• ئیتر ئەوە بوو پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم ـ ماوەی نەدا بە هیچ کەسێك لە هەڵمەتی « حمراء الأسـد » دا بەژداریی بکا جگـە لـە جابیـری کـوڕی عەبدوڵڵا •• ئەویش بیانووی تایبەتیی خۆی هەبوو لـەو دوا کەوتنەیا و روونی کردەوە کە زۆر حەزی ئەکـرد ئامادەی جەنگی ئوحود بێت و لە کیس‌چوونی بە زیانێکی گەورە ئەزانێ •• هۆی دواکەوتنیشی ئـەوە بوو باوکی فەرمانی بە سەرا دا هەتا لە ماڵەوە بمێنێتەوە بۆ سەرو کاریی هەر حەوت خوشکەکەی •

جابیر ئەڵێ :

باوکم پێی وتم : کوڕەکەم بۆمان ناشێ ، نە من و نە تۆ ، ئەم ئافرەتانە بە جێ بێڵین و پیاوێکیان لە ناوا نەبـێ•

وە من ئەو کەسە نیم بێڵم تۆ بچی بۆ جیهاد لە خزمەتی پێغەمبەری خـوادا ـ صلی اللـه علیـه وسـلم ـ ، لای خوشکەکانت بەو بە جێ بمێنە ..

ئینجا عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی سەرۆکی نیفاق و مونافیقان کـە ڕۆژی ئوحود بـە سێصـەد مونافیقەوە گەڕابوویەوە داوای کرد ماوەی ئەویش بدات ، بـەڵام پێغەمبەری پێشەوا ـ صلی اللـه علیه وسلم ـ لەو کاتـە ناسکەدا و لـەو هـەڵوێستە پڕمـەترسـیەدا لـە ڕای پڕدانایەتیی خۆی دانەبەزیی و بە پێویستی نەزانی ماوەی بدا ، چونکە بێبیانوو و بێهۆ دای لە لایەکی لەشکری ئیسلام و گێڕایەوە ..

بە پشتیوانیی خوای گەورە لەشکری پڕ لـە زامی مەدینە کەوتە ڕێ بۆ ڕاونانی قوڕەیش .. بەڵێ ، هـەر چەندە خوێنی زامەکانیان هێشتا نەوەستابوویەوە ، بـەڵام غیرەتی لەشکری خـواناس کەی لـە زام و لـە خـوێن ئەپرسێتەوە ؟

لەشکرێ بە تەمای شەهیدیی و بەهەشت بێ ، کەی باکی لـە ئێش و ئازار هەیە ؟

خوایە یارمەتیت •• پێویستییمان بە یارمەتیتە خوای پەروەردگار تا لە سایە و سێبەری قورئانا لەو غیــردت و جوامێرییەمان دەست کەوێتەوە و بکەوینەوە گەل کاروانی ئیمانداران ••

لەشکری مەککە ویستی بگەڕێتەوە و جارێکی تـر دەست لە موسڵمانەکان بوەشێنێ کە بیستیان لەشــکری مەدینە غیرەتی جوڵاوە و وا بە شوێنیانەوە وای بــە چـاك زانیی بێدەنگ بەرەو مەککە بکشێتەوە و خۆی نەخاتەوە داوی موسڵمانەکان ••

بەمە پێغەمبەری خــوا ـ صلی اللــە علیە وسلم ـ سەلماندی کەوا لــەشکری بتپەرستی مەککە بــەرگەی هەڵمەتی لەشکری خواناسی مەدینە ناگرێ و ئەوانەش ـ لــە جوولەکە و مونافیق و ئــەعراب ـ وا بیر ئەکەنەوە موسڵمانەکان بێهێز و دەسەلاتن ، زۆر بە هەڵەدا چوون و تەنها دیوی دەرەوە ئەبینن ••

## (٣)

عەبدوڵلای کوڕی عەمر شەهید بوو و بە سەری بەرزەوە بەرەو بەهەشت کەوتە ڕێ •• جابیر و حەوت کچی بە جێ هێشت •• قەرزێکی زۆری کەوتبووە سەرشان و ئەویشی بە جێ هێشت بۆ جابیری تاقانە و جگەر گۆشەی ••

کوڕێکی تاقانە و حەوت کچ و قەرزارییی !!

با هەموو موسڵمانێك بیر لە هەڵوێستی خۆی بکاتەوە •• هەوڵدان بۆ بەرزکردنەوەی «لا اله الا الله» لێبڕانی ئەوێ •• با سەیر کا بزانێ خوای گەورە چۆن دەرووی لە خێزانی عەبدوڵلای شەهید کردەوە ؟ هەر بەو جۆرەش دەروو لە ماڵ و منداڵەکەی ئەو ئەکاتەوە •• چۆن قەرزەکەی جابیری بژاردەوە ؟ وەهاش قەرزی منداڵەکانی ئەو ئەبژێرێتەوە •• هەرکەس لەگەڵ خوادا بێت ، خوای گەورە چاکتر لەگەڵ ئەودا ئەبێت •• ئیتر پێویست بە بیانوو و خۆدزینەوە ناکات ••

پێش ئەوەی عەبدوڵلا لە جابیری کوڕی جیا بێتەوە ئامۆژگاریـی کـرد تا چاوی لە خـوشکەکانـی بێت •• بێ نازیان نەکات •• سەروکاریی پەروەردەیان بکات•• بە حەڵاڵ بەخێویان کات •• لە سەر ڕێبازی ئیسلام رایان بێنێ ••

بەڵێ عەبدوڵلا بۆ ڕەزامەندیی خوا و بەرزکردنەوەی ئاڵای بانگەکەی بەرەو شەهیدیی کەوتە ڕێ •• خـوای گەورەش جابیری پیـاوچاکیی خسـتە شوێنی •• جابیر خـوا کردیە پیاوێک بـە شێوەیەك رەفت بکا کە باوکی پێـی خۆش بێت(٧) •• چـوو بێوەژنێکی مارە کـرد •

(٧) بە خوا هەتا سەروماڵ تەرخان نەکەین و ئامادەی شەهیدیی نەبین ، نابینین تاقە منالێکمان شەیدای ئیسلام بێت بە تەواویی ·· هەر کەسێ بە ژیرانە سەرنج بدا بۆی دەر ئەکەوێ ئێمەی دەم موسڵمان چۆن بە دەست منال و خێزانەوە گیرۆدە بووین ·· هۆکەیشی ئەوەیە بە ڕاستیی خۆمان نەفرۆشتووە بـە خوا ·· ئەمانەوێ خۆمان لا بدەین تا منـاڵ بەخێـو کـەین و دواییش ببنـە دوژمنـی بیروباوەڕەکەمان ··

رۆژێکیان پێغەمبەری خوا ـ صلی اللـه علیـه وسـلم ـ پرسیاری لێ کرد و فەرمووی :

ئەی جابیر ئایا ژنت هێناوە ؟

وەڵامی دایەوە : بەڵێ ، ئەی پێغەمبەری خـوا ..

فەرمووی : بێوەژنە یان کچە ؟

وتی : نەء بەڵکو بێوەژنە ..

فەرمووی : ئـەی نەئـەبوو کچێ مارە بکـەی تـا یاریی لە گەڵا بکەیت و یارییت لە گەڵا بکا ؟

وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ، رۆژی ئوحود باوکم شەهیـد بوو و حەوت کچی بـە جێ هێشت .. منیش ئافرەتێکی کارامەم مارە کرد تا سـەر و کاریان بکات و ئاگاداریان بێت ..

فەرمووی : ان شاء الله پێکاوتە ..

سوپاس بۆ خوا ، ئەوەی کە گرنگ بوو سەروکاریی کچەکان بوو .. ئەی دانەوەی قەرزەکە ؟ .

جابیر دێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ـ صلی اللـه علیه وسلم ـ و ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا ، باوکم لـە

فلانــه رۆژا ( رۆژی ئوحود ) شەهید بوو[٨] و قەرزی خورمای بە سەرەوە بە جێ هێشتووم ، ئەوەتا یەکێ لـە خاوەن قەرزەکانی بە گیری هێناوم و داوای قەرزەکەی ئەکات ، جا پێم خۆشە یارمەتییم بدەی بەشکوم بەشـێك لـە خورماکەی دوا بخات بۆ وەرزی داهاتوو ..

فەرمووی : بەڵێ ، ئەگەر خوا ویستی لـە سـەر بوو نزیکەی نیوەڕۆ دێم ..

پێغەمبەری خـوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ لە سەر بەڵێنەکەی خۆی لەگەڵ چەند هاوەڵێکیا بەرەو ماڵی جابیر رۆیشتن . دوای مـاوەخواستن و حـەسانـەوە ، جابیر هەڵمەت ئەدات چێرێك سەر ئەبڕێ و فریای ئەخات .. پێغەمبـەر و هاوڵەکانی تێری لێ ئـەخۆن و گۆشـتێکی زۆریشیان لێ ئەمێنێتەوە .. ئینجا خاوەن قەرزەکە بانگئ ئەکا و داوای لێ ئەکا تاهەندێ لە قەرزەکەی دوا بخات

---

(٨) مەگەر تەنها لە خۆی و هاوچەشنانی بێت شانازیی بکات و هەموو جارێ بیری پێشەوای بخاتەوە کە کوڕە شەهیدە !!

بۆ ودرزی داهاتوو • پیاوەکە ئەڵێ : شتی وا ناکەم • ئەویش بەڵگەی خۆی دێنێتەوە و ئەڵێ : لە راستیدا ئەمە ماڵ و سامانی چەند هەتیوێکە ••

پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ کە زانیی خاوەن قەرز ناتوانێ لە سەری بوەستێ ، وازی هێنا و فەرمانی دا بە سەر جابیردا تا لە خورمای « العجوة » ـ کە یەکێکە لە چاکترین جۆرەکانی خورمای مەدینە ـ قەرزەکەی بۆ بپێوێ و خوای گەورە بۆی تەواو ئەکا کە فەرمووی :

« **کِل له من العجوة ، فان الله تعالی سوف یوفیه** » •

جابیر ئەڵێ :

بە خاوەقەرزەکەم وت : دەفرەکانت نزیك بکەرەوە ، جا دەستم کرد بە پێوانە کردن بۆی هەتا هەموویم بژاردەوە و ئەوەندە و ئەوەندەش خورمای لێ مایەوە ، منیش بە پەلەوەك بروسکە هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ وە هەواڵەکەم دابێ ••

ئیمامی بوخاریی لەم بارەوە لـە چـەند ریوایەتێکا گێڕاویەتەوە دەندێکیان ئەوە ئەگەیەنن کـە پێغەمبەری خـوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمانی داوە بـە سـەر جابیردا تـا خورماکەی بـە پێی جـۆرەکانی جیا بکاتەوە ئینجا هات و بـە سەریانەوە دانیشت و فەرمووی : بۆیان پێوانـە بکە • ئەویش بۆی پێوانـە کردن هەتا هـەموو قەرزەکەی بۆ بژاردنەوە ، لە کاتێکا هـەموو خورماکەی وەك خۆی مایەوە بێ ئەوەی کەم بکات ••

وە لـە هەندێکی تریشا گێڕاویەتەوە کـە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ بە دەوری باغـە خورماکـەیدا سووڕاوەتەوە و لـە خوا پاڕاوەتـەوە فەڕ و بەرەکـەت بخاتە خورماکەیەوە ، جا جابیر ئەیچنێتەوە و قەرزەکەی لـێ تەواو ئەکا ••

بەم شێوە خوا کاروباری شەهیدان و کەس و کاریان ئاسان ئەکا ••

ڕووداوێکی مژدەدەر ئەگێڕنەوە کە بە ئاشکرا مژدە بـە موسـڵمان ئەدات و لـە پلەی شـەهیدیی تێی ئەگـەیەنێ

چەندە بەڕێزە بە لای خواوە ..

دوای چل و شەش ساڵ لە ناشتنی عەبدوڵلای کوڕی عەمر و عەمری کوڕی جەمووح لە گۆڕێکدا ، لافاو لایەکی گۆڕەکە راماڵ ئەکا و خەریك ئەبێت دەر بکەون . جابیر هەواڵ ئەزانێ و ئەڕوا تاگۆڕی تازە هەڵ کەنن بۆ ئەوەی بگوێزرێتەوە بۆی ، سەیر ئەکەن هەر چۆن خراونەتە گۆڕەکەوە ئا بەو شێوەیە ماونەتەوە و مرۆڤ وا ئەزانێ دوێنێ گوزراون ، هەتا لاشەیان نەرم و ئەندامەکانیان ئەچەمینەوە ..

بەڵێ ، موسڵمانان ئەوەیان بە چاوی خۆیان بینی و تێ گەیشتن پلەی شەهید بە لای خوای گەورەوە چەند بەرزە .. بۆیە ئالای ئیسلامیان بە رمەکانیان بەرز بەرز کردەو و بە نیازی شەهیدیەوە بەرەو جیهاد کەوتنە رێ تا بەشکوم ـ بە یشتیوانیی خوای گەورە ـ ئادەمیەکان بگەڕێننەوە بۆ لای خوا و لە هەردوو ژیاندا سەرفراز بن ..

خوا لێتان رازیی بێ ئەی شەهیدانی رێگای رزگاریی ..

زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

(١٦)

# سەعدی کوڕی ڕەبیع

حبیب محمد سعید

خوای پەروەردگارم سوپاست ئەکەم لە سەر بەخشینی ئیمان •• لە سەر ئەم ئاینە بێگەردە •• کە هەموو گیانی هەر هێزە •• لێبڕانە •• فیداکاریە • ئەوەندە بەهێز و بە دەسەڵاتە ، هەر کەسێ بە دڵ و بە گیان دەستی بداتێ ئەیکاتە پاڵەوان •• بەخت کردنی ژیان و رابواردنی دنیا بە لایەوە زۆر ئاسان و ئاسایی ئەبێ لە پێناویا ••

ئاینێکی پڕهێزی بێگەرد ، خۆی خەریکە خۆی بڵاو ئەکاتەوە••• هەڵمەت ئەبا •• ژیان پێشکەش ئەکا •• دڵەکان شەیدا ئەکا •• رۆشنیان ئەکاتەوە •• پڕیان ئەکا لە رووناکیی •• تا سەرەنجام خۆیان ئەکەنە قوربانیی لە پێناویا و بەختەوەریی راستەقینە وەر ئەگرن ••

سەعدی کوڕی رەبیعی ئەنصاریی خەزرەجیش یەکێ بوو لە خاوەنی ئەو دڵانە •• زوو بە زوو موسڵمان بوو •• بەر لەوەی پێغەمبەری خوا ـ صلی اللـه علیه

وسلم ـ موصعەب بنێرێ بۆ مەدینـە موسـڵمان بوو ..
چونکە ئامادەی هەردوو پەیمانەکەی عەقەبە بووە ..

لە پەیمانی عەقەبەی دووەما پێغەمبەری خوا ـ صلی اللـه علیه وسلم ـ موسڵمانە پەیماندەرەکانی تێ گەیاند کەوا پێویستە لە خۆشی و ناخۆشیدا گوێڕایەڵیی بکەن و و ماڵ و سـامانیان بەخت بکەن و لـە پێناوی ئیسـلامدا خەرجی بکەن وە فەرمان بە چاکە بدەن و دوورەپەرێزیی لـە خراپـە بکەن ، وە وتەی راسـت بڵێن و لـە پێناوی خوادا لـە لۆمەی کـەس نەترسن ، ئینجا تێی گـەیاندن هەر کاتێ کۆچ بکا بـۆ ناویـان پێویسـتـە وەك چـۆن بەرگریی لە خۆیان و خێزان و منالیان ئەکەن ، وەهاش بەرگریی لە خۆی و لە ئایینەکەی بکەن و پشت گیریان بکەن .. وە لە پاداشتی ئەمەشا بۆ دیاریی کردن خەڵاتیان بەهەشتە .. بە [illegible] پیـاوانە دەسـتی بداتێ .. پێویسـتە ماڵ و سـامان و دەوڵەمەندیی بخـاتە ئـەوە لاوە لـــە پێنـاویا و هەموو رۆژێ ئامادە بێ لە پێناویا بە شـەهیدیی سـەر بنێتەوە ..

ئەوانیش ـ خوا لێیان رازیی بێت ـ سادە نەبوون ، بەڵکو شـــارەزا و وردبین بوون ، ئـەیانزانیی هەموو بتپەرست و خوانەناسێك ئەبێتە دوژمنیان و لـە هـەموو قۆژێکەوە هێرشیان بۆ دێنن ، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـا بـە شانازییەوە دەستیان خستە ناو دەستی پیرۆزی پێغەمبەری خواوە ـ صلى الله عليه و سلم ـ تا بەشکوم بەهەشتیان دەست کەوێ ..

دوای وت و وێژ و دەربڕینی هەڵوێستی مەردایەتیی و جوامێریی ، پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموی : دوانزە کەسـتان هەڵ بژێرن تـا چاودێـریی خزمەکانیان بکەن .. ئەوانیش بێ پەشۆکان و دوودڵیی دوانزە پیاوی پێکەوتووی ورد و دونیـادیدەیان هـــەڵ بژارد کە یەکێ لەوانە سەعدی کوڕی رەبیع بوو ..

سەعد پیاوێکی لێهاتوو بوو ، لە پێش موسڵمانبوونیا خوێندنەوە و نووسینی زانیوە ، بە مەرجێ لەو سەردەمەدا و لە ناو ئەوانا خوێنـدەواریی زۆر کـەم بوو ، وە هەر کەس خوێندەوار بوایە بە چاوی رێزەوە سەیر ئەکرا ..

سەعدی کوڕی ڕەبیع ـ خوا لێی ڕازیی بێت ـ زۆر دەوڵەمەند بووە ، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر دڵ ئاوەڵا و سنگ‌فراوان بووە .. زۆر حەزی لە میوانداریی و بەخشین کردووە .

ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ کۆچی کرد بۆ مەدینە و خەڵکی شاریش هاتن بۆ پێشوازیی و بەخێرهاتن کردنی .. جا پیاو ماقوڵان و سەرداران ئەهاتنە بەر ڕێی تا لا بداتە ماڵی ئەوان و ببێتە میوانیان و گەورەیان بکات ، سەعدی کوڕی ڕەبیعیش یەکێ بوو لەو پیاوە سنگ‌فراوانانە کە هاتنە سەر ڕێی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ وەدەریان بڕیی کۆمەك و پشتیوانی بۆ ئیسلام و دڵسۆزی ڕاستەقینەی بۆی ..

هەروەها ئەوە بوو کاتێ پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ سەعدی لە گەڵ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفدا کردە برا . سەعد بەوپەڕی جوامێریی و

سنگ‌فراوانیه‌وه رووی کرده عه‌بدوڕڕحمان و پێی
وت :

براکەم من دەوڵەمەندترینی مەدینەم ، سامانەکەم ئەکەم بە دوو کەرتەوە نیوەی بۆ تۆ ، وە دوو خێزانم هەیە سەیریان کە بزانە کامیانت بە دڵە تا تەڵاقی بدەم بۆت ، جا ئەگەر بۆت حەڵاڵ بوو و ماوەی بە سەر چوو مارەی بکە ..

هەڵوێستێکی زۆر بەرزە ، کەم کەسی ئەگاتێ .. لێبووردنێکی بێوێنەیە و تەنها لە سایەی ئیسلامدا ماڵ و سامانی دنیا ئەکرێتە قوربانی بیروباوەڕ ، هەروەك بڵێ:
براگیان دڵ نەدەیت بە دڵ.. تازە من و تۆ براین..
لە سەر فەرمانی پێغەمبەری خوا ــ صلى الله عليه وسلم ــ من و تۆ بووینەتە برا .. هاوبەشی یەکترین لە خۆشیی و ناخۆشییدا ، لە بوون و نەبوونییدا ..

دڵت لە خۆت دا نەمێنێ گوایە تۆ غەریبی و لە وڵاتی خۆت براوی و ئیتر دا ئەمێنی .. من براتم هەرچی من هەمە نیوەی بۆ تۆ .. دوو خێزانەکەم یەکێکیان بۆ تۆ ..

هەتا نالێ لەمەو لا چی کاسپیی و دەستهاتمان هەبوو بۆ هەردووکمان •• نەخێر ئێستە چەندێ سامانم هـەیە کـە دەوڵەمەندترینی مەدینەم نیوەی بۆ تۆ ••

وە نالێ ژنێکیشت بۆ ئەخوازم ـ کە زۆر ئاسانە بۆ ئەو ـ بەڵکو ئامادەیە کام ژنەی بە دڵی براکەیەتی بۆی تەڵاق بـدا ••

ئەمە لە کـوێ و هەڵپە و تـەمـاع و پاشڕوولدانی نەفامان لـە کوێ کە دەمیان هیچی لێ کەم نیە ••

عەبدوڕڕەحمان وتی : خوا فەڕ و بەرەکەت بخانە ماڵ و خێزانتەوە •• بازاڕم پیشان بدەن •• ئـەوانیش بازاڕی نەوەی قەینەقاعیان نیشان دا و موسڵمان ئاسـایی دەستی دایە کاسپی حەڵاڵ ••

کاتێ کە جەنگی بەدریش هاتە بەرەوە سـەعد ی کوڕی رەبیع پیاوانە لەگەڵ سێ خزمی تریا لە نەوەی حاریث بەژداریان تیا کرد کـە ئەو سیانەش خارجـەی کوڕی زەید و عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە و خـەللادی کوڕی سوەید بوون ••

لەم جەنگەدا سەعد توانی لە یەکێ لـە کافرەکان بکوژێت کە ناوی ریفاعـەی کوڕی عابد بوو لـە نەوەی مەخزووم کە هۆزی خالیدی کوڕی وەلید بوو ، وە نەوەی شایانی باسە لە جەنگی بەدرا لە نەوەی مەخزووم بیست و چوار پیاو کوژرا کـە یەکێك لـەوانە ئـەبووجەهلی سەرۆکی لەشکری بتپەرستیی بوو ..

موسڵمانەکان بە سەری بەرزەوە گەڕانەوە پایتەختی دەوڵەتی قورئانی تا زیاتر خواپـەرسـتیی بە جێ بێنن و زیاتر لـەگـەڵ دڵ و دەروونیانـا خەریك بن بۆ ئەوەی بتوانن بـە چاکیی و پاکیی سوپاسی خوای پەروەردگار بکـەن ..

بۆ ساڵی ئاینندە قورەیش کەوتە خۆ ئامادە کردن و لەشکر ڕێك خستن تا هەڵمەت بێننە سەر موسڵمانەکان .. لەو کاتەدا عەبباسی مامۆی پێغەمبەری خوا ـ صلی اللـه علیه وسلم ـ نامەیەکی نووسـی بۆ پێغـەمبەری خوا تـا هەواڵی نیازی قورەیش و ژمارەی جەنگاوەرانی بداتێ .. نامەی نووسی و مۆری کرد و پیاوێکی لە نەوەی غیفار بە

کرێ گرت بە مەرجێ بە سێ ڕۆژ بگاتە مەدینە و نامەکە بگەیەنێتە دەستی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ وە بە دەستی خۆیەوە نەبێ نەیداتە دەستی هیچ کەس ..

پیاوە غیفاریەکە گەیشتە مەدینە و پێغەمبەری خوای ـ صلی الله علیه وسلم ـ دەست نەکەوت .. هەواڵی زانی وا لە قەباء .. ڕۆیشت بۆ لای و لە دەرگای مزگەوتەکەی قەباءدا نامەکەی دایە دەست ..

جا فەرمانی دا ئوبەی کوڕی کەعب بۆی بخوێنێتەوە. کە خوێندیەوە بۆی ، فەرمانی دا بە ئوبەی تا ئەو هەواڵە ئاشکرا نەکا ..

ئینجا پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ چوو بۆ ماڵی سەعدی کوڕی ڕەبیع و فەرمووی :

ئایا کەس لە ماڵەوەیە ؟

وتی : نەء ، فەرموو چیت پێویستە ، ئەی پێغەمبەری خوا ، باسی بکە ..

پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ چونکە سەعد بە لایەوە زۆر جێی متمانە بوو و یەکێ بوو لە سەردارانی

مەدینە ، دەنگ و باسی نامەکەی عەبباسی مامی و هاتنی
وورەیشی بۆ گێڕایەوە ..
سەعد وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ، مـن هیوادارم
ئەوە خەیر و چاکەی تیابێ ..

پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیە وسلم ـ فەرمانـی
ا بـە سەعدا تا ئەو دەنگ و باسە ئاشکرا نەکات ،
ئینجا گەڕایەوە بۆ مەدینە .. ئـا لەو کاتەدا خێزانەکەی
سەعد هاتە دەرەوە بۆ لای مێردەکەی و وتی :
پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیە وسلم ـ چی پـێ
فەرمووی ؟ وتی : جا تۆ چیت داوە لەوە ؟

وتی : خۆم دا گرتبوو تـا بزانم چی ئەڵێن .. ئینجا
هـەرچی پێغەمبەری خـوا ـ صلی اللـه علیـە وسلم ـ
فەرمووبووی هەمووی گێڕایەوە بۆ مێردەکەی ..
سەعد زۆر داخی لێ هات بۆیە وتی :
« **انا لله وانا الیه راجعون** » .
زۆر داخی لـێ هات بۆ نـەفامیـی و نـەزانیـی
خێزانەکەی .. پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیە وسلم ـ

متمانەی بەم کردووە و بێخەمیش بووە کـە کەس بـ
گوێوە نیـە ، بۆیە نهێنیی خۆی و موسڵمانەکانی لای ئـە
درکاندووە ..

زۆری پێ ناخۆش بوو ، ئافرەتێ ناوا خۆی لـە
پیاو دا گرێ..چۆن ئەبێ هەوڵی زانینی نهێنی پێغەمبەری
خوا بدا ؟ لە جیاتی ئەوەی دڵسۆزیی بۆ ئیسلام بنوێنێ و
شـان بە شـانی مێردەکەی خزمـەت بکات و سـەری
موسڵمانەکان بەرز کاتەوە ، ئەمەی لێ ئەوەشێتەوە ..

لە داخانا پێی وت : وام نەزانیوی خۆت دا گری و
گوێمان لێ بگرێ ، من وا بێخەم بە پێغەمبەری خوام ـ
صلی الله علیه وسلم ـ وت : فـەرموو چیت پێویسـتە
باسی بکە ..

جا لە ترسی ئەوەی ئافرەتەکە ، وەك نەفامیی کرد
خۆی داگرت و لە وتەکانیان خۆی ئاگادار کرد نەفامییەکی
تـر بکات و بڵاوی بکاتەوە ، ناچار بوو دەستی دایە قژی
سەری و بە شوێن خۆیا رای کێشا هەتا لە بەردێکی نزیکی
مزگـەوتی غـەمامە فریای پێغـەمبەری خـوا کـەوت و

ئەکەش بێهۆش کەوت ..

مرۆڤ لە بەردەم هەڵوێستی وا دا وشك ئەوەستێ :

ئەبێ سەعد چەندێ شەرمەزاری ئاشکرابوونی هێنێی پێغەمبەری خوا بوو بێت ؟ .

ئەبێ چەند ناڕەحەت بوو بێ بە دەست ئەم هەنگاوە نەوامانەی خێزانەکەیەوە ؟ .

هەر چۆن بێ سەعد خۆیشی و هەموو کەسێکیش ئەکاتە قوربانی بیروباوەڕەکەی ..

ئەم ئامادەیە سەروماڵی بەخت کا تا بیروباوەڕەکەی بەرز بێتەوە .. وە وای بە پێویست ئەزانێ خێزانەکەی کۆمەك و پشتیوانی بێت ، چونکە بە وبستی خۆی موسڵمان بووە و ناگونجێ ناپاکیی لێ بووەشێتەوە . ئەم سروهەستە لە کوێ لە چاو ئەوەدا کە خێزانەکەی ببێتە مایەی شکستیی بیروباوەڕەکەی و ئابڕووی ئەمیش بچێت .. ئەو هەموو متمانەیە کە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - پێی دا بوو ..

غیرەتی سەعد ئاوا بوو بۆ ئیسلام .. نەك سەعد

بەڵکو ئەندامانی کۆمەڵی ئیماندار هەر هەموویان ئا
بوون بۆیە توانیان پشتی نەفامیی بدەن بە زەویدا
گەلانی سەرزەوی ئاوەدان کراوەی ئەو رۆژە بەر
خواناسیی و ژیانی ئادەمیی راستەقینە بەرن..

سەربازی موسڵمان دڵسۆزیی و غیرەتی نەبێ ا
بێ .. ئەبێ بە تەواوەتیی لێ بڕابێ بۆ ئەوەی خوا
گەورەی لێ رازیی بێ و بەخششە بەڵێنماوەکا
بڕژێنێ بەسەدرا ..

بەو حاڵەوە ژنەی گەیاندە خزمەتی پێغەمبەری خ
ـ صلی الله علیه وسلم ـ بە جەرگێکی پیاوانەوە ـ ک
دیارە هەڵوێستێکی کاریگەرە و پیاوی ئەزێ خۆی پ
بگیرێ ـ وتی :

ئەی پێغەمبەری خوا ، خێزانەکەم پرسیار
فەرمایشتەکەتی لێ کردم و منیش بۆم ئاشکرا نەکرد
کەچی وتی : گوێم لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خـ
بوو ـ صلی الله علیه وسلم ـ وە هەموو قسەکان
گێڕابەوە .. جا ، ئەی پێغەمبەری خوا ، ترسام شتێ

ئەوە ئاشکرا بێ و تۆیش وا بچێتە دڵتەوە کە من
بێنییەکەتم ئاشکرا کردووە ..

پێغەمبەری خوا - صلی الله علیە وسلم - لە
خۆویستی سەربازی موسڵمان و کوێڕایەڵیی و دڵسۆزیی
و خەمخۆریی بۆ ئابڕووی خۆی تێ گەیشت .. جا
فەرمووی : وازی لێ بێنە ..

گرنگ ئەوە بوو دەرکەوێ سەعد لە کەڵ ئیسلامدا
راست ئەکات .. گرنگ ئەوە بوو دەرکەوێ
خۆشەویستیی خوا و رێبازەکەی تاکە خۆشەویستیی
و ولایی دڵەتی ..

ئەوەندەی پێ نەچوو قوڕەیش زێز بە زێزیی
پەیوەندیی کرد بە مونافیقەکان و جوولەکەوە و هەواڵیان
انێ وا هێرشێکی گەورەیان بە دەستەوەیە و با ئەوانیش
ئاگادە بکەن و دەست و دڵی موسڵمانەکان سارد
بکەنەوە ..

بەڵام هەر کەسێ پەیمانی بە خوا دا بێ پێغەمبەری
خوای - صلی الله علیە وسلم - کردبێتە پێشەوای خۆی،

چۆن بە پاگاندەی مونافیق و خوانەناسان دەست و دڵی سارد ئەبێتەوە ؟

بەڵێ ، قورەیش بە سێ هەزار جەنگاوەرەوە هاتە سەر مەدینە و موسڵمانەکانیش مەردانە قۆڵیان لێ هەڵ ماڵی ، بە تایبەتیی گەنجەکان ، هەر هەموویان لەوپەڕی خۆشیدا بوون ..

رەنگە یەکێ بپرسێ : جا بۆچ خۆشیان بوو ، خۆ ئیسلام ئاینی ئاشتییە و حەزی لە جەنگ و هەرا نیە ..

ئەمە زۆر راستە .. وە ئاینی ئیسلام وا موسڵمانەکان را ئەهێنێ گرۆی ئادەمیان خۆش بوێ و بەوپەری خۆنەویستییەوە بانگی بکەن بۆ لای خوا .. بەڵام ئەی کە کافری دڵڕەش کۆڵ نادا و بە دوو چاو موسڵمانی رەوشت بەرز نابینێ ، چار چیە ؟

لە لایەکی ترەوە گەنجە موسڵمانەکان غیرەتیان جۆشا بوو ، یەکەم : خوا خوایان بوو شەهیدیان دەست کەوێ .. هەر گەنجێ سەرنجی ئەدا تەمەنێکی هەیە ئەگەر بە شەهیدیی نەبڕێتەوە ، خۆ نەبێ هەر ببڕێتەوە،

جـا بۆچ لـە شەرەفی جیهاد و شەهیدیی بێبەش بێ ؟

دووەم : کۆمەڵی موسڵمان تاوانی چیە وا کافری خوانەناس شەڕی پێ ئەگێڕێ •• پانزە شانزە ساڵە ئاڵای دژایەتییان بەرامبەر موسڵمانە چەوساوەکان لـە سەر چی بەرز کردۆتەوە ؟

موسڵمان ئەیەوێ خوای گەورە لـە خۆی رازیی بکا ، ئەوان بۆ نایەڵن ؟ بۆ دێنە سەر پایتەختی ئیسـلام ؟ جـا توخوا موسڵمانێ لـە سەر ئەوە نەڕوا ئەی لە سەر چی بڕوا چاکە ؟

گەنجەکان حەزیان ئەکرد پێغەمبەری خوا ـ صلی اللـه علیه وسـلم ـ جەنـگ بەرێتـە دەرەوەی شـار و نەکەوێتە شوێن رای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی مونافیق ، بۆیە یەکێکیان وتی : ئێمە ئاواتمان بۆ ئەم رۆژە خواستووە و لە خوا پاڕاوینەتەوە بۆی، ئەوەتا بۆی هێناوینەتە پێشەوە و بۆی نزیك کردووینەتەوە ••

زۆربەی ئەوانەی کە فریا نەکەوتبوون بەژداریی جەنگی بەدر بکەن زۆر حەزیان ئەکرد بچنە دەرەوە تـا

دوژمنیان وا نەزانن موسڵمانەکان لە بەر ترس وە یا لاوازیی خۆیان حەشار داوە ..

لەشکری موسڵمانەکان بە سەرکردایەتیی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ گەیشتە بناری کێوەکانی ئوحود . واتە : لەشکری مەککە کەوتە نێوان لەشکری موسڵمانەکان و مەدینەوە..بەڵام لە بەر ئەوەی لەشکری موسڵمانەکان لە هەموو لایەنێکەوە لە لەشکری مەککە کەمتر بوو جگە لە لایەنی ئیمانیی ، پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ هەوڵی دا نەخشەیەکی رێك و پێك بکێشێت بۆ لەشکرەکەی ..

پێش هەموو شتێك شوێنێکی گونجاوی هەڵبژارد بۆ سەربازەکانی، ئینجا چەند پیاوێکی پاڵەوانی هەڵبژارد، کە هەر یەکەیان کێشی هەزارەها کەسی هەبوو ، وە خستنیە پێشی پێشەوەی ریزەکانەوە ، تا هەر کاتێ جەنگ گەرم بوو ، ئەوانە پێشڕەوی لەشکر بن .. یەکێ لەو پاڵەوانە دەستنیشانکراوانە سەعدی کوڕی رەبیع بوو..

جەنگی ئوحود کۆتایی هات دوای ئەوەی

موسڵمانەکان خۆیان گرتەوە و لـە دەوری پێغەمبـەری خـوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ گلێر بوونەوە و هێرشی قورەیشـــیان وەستاند .. بـەڵام دوای ئەوەی کۆمەڵـە شەهیدێکیان دا لە بری ئەو هەڵەیەدا کـە تیراندازەکانی سەر گردەکە لێیان دا کەوت ..

لە کۆتاییدا پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ دەستی کرد بە سەرنجدانی ئەنجامی جەنگەکە و هەواڵ پرسینی هاوەڵـەکانی تـا بزانێ کێیـان شـــەهید بووە، وە لەگەڵ موسڵمانەکانا دەستیان دایە گـەڕان بـە نـاو لاشەکانا تـا فریای زامدارەکان بکەون و شەهیدەکانیش بسپێرن بـە گڵ ..

پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ بە تایبەتیی هەواڵی سەعدی کوڕی ڕەبیعی پرسی ئایا زیندووە یان شەهید بووە ؟

بۆ ئەمە موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاریی(۱)

(۱) لە ریوایەتێکا پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ زەیدی کوڕی ثابیت ـ خـوا لێی رازیی بێت ـ ئەنێرێ و پێی ئەفەرموێ : ئەگەر دیت لە

ـ خوا لێی رازیی بێت ـ بەرەو ناوچەی جەنگەکە کەوتە رێ تا ســەرەنجامی سەعد بزانێ •• لە کاتێکا بــە ناو مەیدانی جەنگا ئەسووڕایەوە ، سەیری کرد وا ســەعد خەڵتانی خوێنە و خوێن لە زامەکانی سەری کــردووە و وا لە سەرەمەرگایە ••

لە سەری چەمایەوە و هەواڵی دایێ کەوا پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ بــە تایبەتیی ئەمی ناردووە تا هەواڵی بزانێ •• سەعد بە دەنگێکی زۆر نزمەوە پێی وا گەیاند کە زامەکانی کاریگەرن و تا رادەیەك ئومێدی ژیانی نەماوە •• ئینجا دواهەناسەی دا و جیهانی بــە جێ هێشت ••

بەڵێ ، لە کاتێکا ســەعد کە لە سەرەمەرگا و لــە

منەوە سەلامی پێ بگەیەنە •• کە زەید دۆزییەوە سەیری کــرد حەفتا زامی رم و شیر و تیری پێوەیە و وا لە سەرەمەرگا •• سەعد ، لە دوای وەڵامدانەوەی سەلامەکەی پێغەمبەر ، وتی : پێی بڵێ : ئــەی پێغەمبــەری خــوا ، بۆنی بەهــەشت ئەبیستم ••

چەشتنی تاڵاوی گیان کێشمانا بوو ، لـە بیری نەچـوو بوو سەربازێکی کوڵنەدەری ئیسلامە و پێغەمبەری خـوا ـ صلی الله علیه وسـلم ـ پێشمـەوایـەتی .. بیری لـەوە نەکردەوە نـەوەکو پێغەمبـەری خوا تووشی ناڕەحەتیی ببێ .. نەوەکو بێناز بێ ..

ئا لەو کاتەدا کە چەند هەناسەیەکی بە دنیاوە ما بوو ، بیری لە ژن و مناڵەکانی نەئەکردەوە[2] ، بەڵکو هۆشی

---

(٢) سەعد دوو کچی بە جێ ماوە .. یەکێکیان ناوی جەمیلە بووە کـە بـە ئومسەعد ناو براوە ئـەم کچـەی ئەچێتە لای ئەبووبەکر و ئەویش ـ خـوا لێی رازیی بێت ـ پیاوانە کراسەکەی خۆی بۆ را ئەخات تا لە سەری دانیشێت ، ئەمەش لە کاتێکا بووە کە خەلیفەی موسلمانەکان بووە .. میوانێك ئەگـەر زۆر زۆر بەڕێز بێت بـە لای خەلیفـەوە کراسەکەی خۆی بۆ را ئەخات ، دیارە لـە بـەر نەبوونی هیچ راخەرێك .. لەو کاتەدا عومـەر ـ خوا لێی رازیی بێت دێتە ژوورەوە و ئـەپرسێ ئەمە کچی کێیـە ؟ ئەبووبەکر فەرمووی : ئەمـە کچی پیاوێکـە لە منیش و لـە تۆش چـاکترە .

تەنها بە لای پێغەمبەری خواوە بوو .. ئەوەندەی خۆش ئەویست هەموو شتێکی لـە بیر چوو بوویەوە .. هەتـا خۆیشی لە بیر چووبوویەوە .

ئەوە بوو لەو چەند ساتەی کۆتایی ژیانیا هەلی بـە دەست هێنا و نامەیەکی زاریی بە سـپاردە دایـە دەست موحەممەدی کوڕی مەسلەمە تـا بیگەیەنێ بە پێغەمبەر کە بریتی بوو لە سەلامێکی گەرم و گوڕ لە سەربازێکی بـە وەفاوە بۆ تاقە سەرکردەی مرۆڤایەتیی .. ئینجا وتـی : پێی بلێ : سەعدی کوڕی رەبیع ... ت را ئەگەیەنێ و ئەلێ: لەسـەر ئێمـە خـوا پاداشتت بداتەوە چـاکتر لـەوەی پاداشتی پێغەمبەرێکی دابێتەوە لە سەر ئوممەتەکەی ..

بەڵێ، سەعد وا لە سەرەمەرگا و خەریکە لە پێناوی ئیسـلامدا ئەم ژیانەی تەواو بێ ، سەلام و رێز بۆ پێشەوا

---

... پرسیی : ئەوە کێیە ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووی : پیاوێکە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەم جیهانەی بە جێ هێشتووە و لە بەهەشتا جێگای خۆی گرتووە و من و تۆیش هەر ماوین ..

ئەنێرێت •• داوا ئەکا خوا پاداشتی بە چاکە بداتەوە ••
لە سەر چی ؟ لە سەر ئەوەی ئەو هیدایەتی وەرگرتووە
و شەهیدیی دەست کەوتووە !!

ئینجا نامەیەکی تری نارد بۆ خزمە ئەنصارەکانی بە موحەممەدی کوڕی مەسلەمەدا و وتی : سەلامم بە خزمەکانت را گەیەنە و پێیان بڵێ[٣] : سەعدی کوڕی رەبیع پێتان ئەڵێ : هیچ بیانوویەکتان بە لای خواوە نابێ ئەگەر هەتا ئێوە ماون و ئاو لە چاوتانایە پێغەمبەرەکەتان ـ صلی الله علیه وسلم ـ خراپەی لێ نزیك بێتەوە ••

بەڵێ بەم شێوەیە وەسێتی کرد بۆ دانیشتوانی مەدینە کەوا مەرد بن پێغەمبەری ئازیز و ئایینە بێ گەردەکەی میوانتانن و لە سەر بەڵێنی خۆتان هاتنە ناوتان •• مەرد بن ساردیی نەنوێنن •• نەترسن ••• باکتان نەبێ •• سەروماڵتان بکەنە قوربانی خۆی و بیروباوەڕەکەی ••

---

(٣) موحەممەدی کوڕی مەسلەمە خەزرەجییە و هاوپەیمانی نەوەی عەبدولئەشهەلی ئەوسییە • مەبەستی لە خزمەکانی ئەنصارەکانە ••

موحەممەدی کوڕی مەسلەمە سەیر ئەکا سەعد ئەوەندەی بە دنیاوە نەماوە و هێنانەوە و جوولانیشی بێسوودە ، بۆیە لە لای مایەوە هەتا بەیەکجاری جیهانی بە جێ هێشت و چاوە بە قوڕسان رەزراوەکانیشی بۆ دواجار نووقاند تا بە کۆمەکیی خوا ئەمجارە لە بەهەشتی پڕ لە ناز و نیعمەتا بیان کاتەوە .. ئەوسا گەڕایەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا و هەواڵی شەهید بوونی و وتەکانی بۆ گێڕایەوە(٤) ..

پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی :

**« رحمه الله ، نصح لله ولرسوله حيا وميتا »**

خوا رەحم و سۆزی خۆی برژێنێ بە سەریا بە زیندوویی و بە مردوویی هەر خەریکی ئامۆژگاریی بوو بۆ شوێنکەوتنی خوا و پێغەمبەرەکەی وە بۆ بەرزکردنەوەی فەرمایشتیان ..

---

(٤) لە کاتی ناشتنی شەهیدەکانا سەعدی کوڕی رەبیع لەگەڵ خارجەی کوڕی زەیدا ـ کە ئامۆزای باوکی بوو ـ پێکەوە نرانە یەك گۆڕەوە ..

بەڕێز و خۆشەویستم ئەی سەعد .. ئەی قوتابیی قورئان .. ئـەی سـەربازی ئیسـلام .. ئەم دڵە پاکە و مێشکە سافە و سنگە فراوانەت چۆن پەروەردە کردن ؟

دیارە لە قوتابخانەکەی پێغەمبەرا ـ صلی اللە علیـە وسلم ـ پەروەردە کـراوی ئەی سـەربازی بـەوەفا .. خوێنی گەشی دەمارەکانت خەریك بوو لە زامەکانتەوە بـە گەرمیی و بـە گەشیی و بە ئاڵیی ئەهاتە خـوارەوە و جلەکانتی رەنگ ئەکرد و ئەوسا ئەڕژایە سـەر لمەکە و چۆڕاوگەی ئەبەست . تا خوێن و جل و لمەکە شاهێد بن تۆ رێبازەکەی خوات ئەوەندە خۆش ئەویست وا خۆت کردە قوربانی لـە هەمان کاتا ئێش و ژانی گیانکێشـان سەری لێ دا بووی و هەناسەکانت کە مابوون بە پەنجەی دەست ئەژمێران ، زمانە پاراوەکەشت بە قورئانی پیرۆز بـە هەلی ئەزانی نامەیەك بۆ پێشەوا و یەکێکیش بۆ بـرا سەربازەکانت بنێری .. سەلام و ورە و غیرەت و وەفـا و مەردایەتیی تیایانا تۆمار کەیت ..

بـە راستیی بەرزیت .. خەجاڵەت خۆمـان دوای

ئێوەی پاڵەوان ئێمە بووینە هەڵگری قورئان ..

خەجاڵەت خۆمان کە جلە لە فرمێسکی قەتیس ماوی چاوەکانمان هیچمان لێ نایێ بۆ ئیسلام ..

تۆ ئەترسایت خزمەکانت پێغەمبەر و قورئانەکەی بێ ناز کەن .. نا .. ئەوان مەرد بوون .. ئەوان پیاو بوون .. ئەوان خاوەن بەڵێن بوون .. ئەوان ژیانی دنیایان ئەکردە قوربانی قیامەت .. بەڵام ئێمەی خەجاڵەت بار قورئان و سوننەتمان بێ ناز کردن .. بەڵام، سوپاس بۆ خوا، وا سەرنجی خۆمان ئەدەین و تۆمەی خۆمان ئەکەین و تۆزی ماوەی دوور و درێژی خەواڵووییمان بە سەروچاومانەوە ئەتەکێنین و خوا کۆمەك بێت چاو ئەبرینەوە هەنگاوە پیرۆزەکانتان ..

زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

(١٧)

# عەمری کوڕی جەمووح

حبیب محمد سعید

## (١)

ئیسـلام ئاینی پەروەردگارە ٠٠ خۆشەویستیی ئەچێتە دڵـی ئەوانـەوە کـە خواپـێ‌داون ٠٠ خۆشـیی لەوەدایە هەرکەسە بـە پێی نیازی دڵی خۆی ، خـوای گەورە لـە گەڵیا ئەکا ٠٠

سوپاس بۆ خوا ، نیازی دڵ و ئامادەبوونی موسڵمان تا خزمەتی ئاینەکەی بکا ، بە پاداشت بۆی ئەنووسرێ ٠٠ وە ئەوەی بـە دڵ و بـە گیـان ئامادەی بـەخت‌کردنی سەروماڵ بێت،خوای گەورە بە ئاواتی خۆی ئەگەیەنێ ٠٠

عەمری کوڕی جەمووح یەکێکە لەوانەی بە دڵ و بە گیان ئاوات ئەخوازێ بۆ شەهیدیی ٠٠ دڵی ئەگرێ تا خوێنەکەی لە پێناوی ئیسلاما بڕژێ ٠٠

عەمر پیـاوماقووڵ و ناوداری مەدینـە بوو ٠٠ وە

سەرداری ئەوەی سەلیمە بوو .. وە یەکێ بوو لە پیاوەخاوەن جوامێرییە سنگ‌فراوان و دڵ‌گوشادەکانی مەدینە ..

پیاوماقووڵانی سەردەمی نەفامیی ، بۆ ئەوەی خۆیان لە هەژار و دەست‌کورتان هەڵبژێرن و جیا بکەنەوە ، هەریەکەیان لە ماڵەوە بتێکی تایبەتیی بۆ خۆی دا نا بوو ، تا بەیانیان و ئێواران پیرۆزیی ئەوە دەست کەوێ و لە وەرزە تایبەتییەکاندا قوچ و قوربانیی بۆ بکات و لە تەنگانەشدا هانای بۆ بەرێت .. عەمریش بتێکی هەبوو کە ناوی « مەنات » بوو و لە چاکترین و بەنرخ‌ترین جۆری تەختە دروستی کرد بوو ..

بت‌پەرستیی دەردێکی کوشندەیە ، جا هەر کۆمەڵێ لە راستیتیی بانگی خوا نەگا و بە تاك و تەنیا خوا نەپەرستێت ، بە خۆی بزانێ و بە خۆی نەزانێ ، وا لە سایەی بت‌پەرستیا ، ئیتر بە هەر شێوەیەك بێت .. بت‌پەرستییەك بۆ ژیانێکی دنیایی کورت ، مرۆڤ رێز و شەرەف و ئابرووی خۆی دا ئەنێ .. بە تایبەتیی مرۆڤی

ئەم چەرخە، کە هەر کەسێك ڕێگای خوای نەدۆزیبێتەوە تـا بینەقاقەی لە لیتەی بتپەرستیا چەقیوە و شانازیشـی پێوە ئەکات •• دەمێ بـە ناوی زانیارییەوە و دەمێ بـە ناوی پێش کەوتنەوە و دەمێ بە ناوی رزگارییەوە و دەمێ بە ناوی مافەوە • دەمێ بۆ پارە و سامانی حەرام و دەمێ بۆ ئافرەتی بـەرەڵای سـەرجادە و بارەکان و دەمێ بۆ رابواردنی پڕ لە شوورەیی و دەمێ بۆ فیـز و دەمـار و خۆهەڵ کێشان ••

بەڵێ ، عەمریش نەفام بوو •• شانازیی ئەکرد ئەو سەرداریکی ناودار بێت و بتی تایبەتیی خۆی هەبێ و لـە ناو خەڵکا دیار بێت •• ئیتر بیری نەئەکردەوە و بپرسێ: دار و بەرد چ دەسەڵاتیکیان هەیە و بە کەڵکی چی دێن ؟

ئەوەندە بتەکەی چوو بوو بە دڵا هەمیشە خەریك بوو خزمـەتـی ئـەکـرد و بـایـەخی ئـەدا بـە بۆنخۆش کردنی •• زۆری خۆش ئەویست •• دڵەکەی شەیدای بوو بوو •• هەر ئەبێ وا بـێ ، دڵ هێلانـەی خۆشەویستیە •• بۆ خۆشەویستیی دروست کراوە ••

جا ئەگەر خۆشەویستی راستەقینەی نەدۆزیبەوە ئەوا ناچارە خۆشەویستی رووکەش بۆ خۆی پەیدا بکات و دڵەکەی ، بە چەکوشی نالەباری پەروەردەی نەفامیی و دنیابەرستیی ، ناچار بکا تا دەرگای بۆ بخاتە سەر پشت و جێی بکاتەوە ..

عەمر وا لەم ژیانە نەفامییەدا ئەژیی و ساڵەکانیش یەك لە دوای یەك دێن و لاپەڕەکانیان هەڵ ئەدرێنەوە ، تا ئەوەی بە سەر چوو هەرگیز نەگەڕێتەوە و تەمەنی عەمریش لە شەست تێ پەڕیوە و خۆری ژیانی وا خەریکە ئاوا ئەبێ ، بێ ئەوەی بیری لە خۆی و لە ژیانی بکاتەوە ..

ئا لەم کاتەدا تیشکی ئیمان لە مەککەوە بەخشان بوو و بەشی زۆری گرتە شاری یەثریب .. شاری جوامێریی و سنگ فراوانیی و قوربانیی .. مامۆستای مەدینە موصعەبی کوڕی عومەیر ـ خوا لێی رازیی بێت ـ بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ـ صلی اللە علیە وسلم ـ گەیشتە مەدینە و رووناکیی بەخشانی ماڵ بە ماڵی شار

کرد •• دڵە پاکەکەی و مێشکە وریاکەی و زمانە پاراوەکەی کاریان کردە سەر دڵەخەواڵووەکان و بێدار بوونەوە •• بەڵام زیاتر دڵە ناسکەکان •• دڵ و مێشکی گەنجە خوێن گەرمەکان بە ئاسانیی جێگای رۆشنایی قورئانیان تیا ئەبوویەوە •• عەمریش سێ کوڕی هەبوون: موعەووەد و موعاذ و خەللاد ، هەرسێکیان لەگەڵ دایکیانا و لەگەڵ کوڕێکی خزمی هاوتەمەنیان موسڵمان بوون ، بێ ئەوەی عەمر پێیان بزانێ ••

هیندی کچی عەمری کوڕی حەرام کە خێزانی عەمری کوڕی جەمووح بوو ، زۆر ژیر و ئازا و بەجەرگ بوو •• سەرنجی دا وا ئاینی پاکی خواناسیی شاری هەموو گرتەوە و دانیشتوانیش بە تەواویی باوەشی خۆشەویستییان بۆ کردەوە ، بە تایبەتیی سەرداران و پیاوەگەورانی شار ، وە وا جگە لە عەمری مێردی و چەند کەسێکی کەم هیچ سەردارێك لە سەر رێگای کوفر نەماوەتەوە ••

جا لە بەر ئەوەی ئافرەتێکی خاوەن سەلیقە و

دانشــمەند بوو ، زۆر بــە تەنگ قازانجی مێردەکەیەوە بوو .. زۆری خۆش ئەویســت و زۆریش ڕێزی لــێ ئەگرت .. چونکە بــە ڕاستیی ئەویش پیاوی ناو پیاوان بوو .. جا کە ئەی بینی سەرداره هاوشانەکانی ڕێـگای سەرفرازیی هەردوو جیهانیان گرتە بەر ، بــەزەیی بــە عەمرا ئەهاتەوە و ترسی ئەوەی لە دڵا بوو نەوەکو لــە ســەر ڕێبازی کوفر و خــوانەنــاسیی بمێنێتــەوە و ببێتە سووتەمەنیی ئاگری دۆزەخ ..

ئــەمە ئامۆژگاریەکی زۆر گەورەیــە بۆ ئافرەتی موسڵمان ، نەکەن دڵیان وا بەستەی دنیا بێت و پیاوەکان بەشتی منداڵانەوە بخلافێنن .. هەتا ئەوان خــەمخــۆری ڕاســتەقینــەی ئیســلام نــەبن و ئامادەی مــەینــەت و چەرمەسەرێ نەبن لە سەر ئیسلام ، بازووی پیاوەکان بە تەواوەتیی ناکەوێتە کار بۆ ڕزگارکردنی ئادەمیی ..

لــە هەمان کاتا عــەمریش دەنــگ و باسی ئاینی تازەی ئەبیست ئەخورپایە دڵیەوە و ترسی لێ ئەنیشت لەوەی نەوەکو کوڕەکانی لە ئاینی باو و باپیری خۆیــان

واز بێنن و بکەونە شوێن موصعەب .. ئەو پیاوەی کە هەڵگری ئایینی ئیسلامە و وا توانیی بە ماوەیەکی زۆر کەم خەڵکێکی زۆر لە ئایینەکۆنەکەیان پەشیمان کاتەوە و بیانخاتە ریزی سەربازانی قورئانەوە..

ئەمە لە دڵیا ماخولای بوو ، تا ناچار رۆژێکیان بە لای هیندی خێزانیەوە درکاندی .. بۆیە پێی وت :

ژنەکە ، ئاگادار بە نەوەکو کوڕەکانت لە خۆیانەوە بنیشنە مل و بکەونە شوێن ئەم پیاوە ( واتە : موصعەب ) تا بیرێکی لێ بکەینەوە ..

ووتی : گوێ رایەڵو دەست بەردارم بەڵام ئەیەی پێت خۆشە گوێ بگری لە موعاذی کوڕت بۆ ئەوەی کە لە بارەی ئەو پیاوەوە ئەیگێڕێتەوە؟

وتی : ئافرەت ، بێبەڵابی ، ناشێ موعاذی کوڕت لە ئایینی خۆی وەرگەڕابێتەوە و منیش بێئاگا بم ؟!

ئافرەتەکە زۆر بەزەیی بە مێردەکەیا هاتەوە ، وا ئەوەندە دڵسۆزی ئایینی بتپەرستیە و خەمیەتی

کوڕەکەی لێی لا بدا ، وە وای بە چاك زانیی راستە و خۆ لای ئاشکرا نەکات ، بۆیە وتی :

نەء ، بەڵام ئامادەی هەندێ لە دانیشتنەکانی ئەو پیاوە بانگ‌کەرە بووە و هەندێ لە وتەکانی لە بەر کردووە ..

وتی : بانگی کەن بۆم ..

موعاذیان بانگ کرد و هات لە بەر دەستی باوکیا دانیشت .. وتی : ئادەی شتێك لەوەی کە ئەو پیاوە ئەیلێ ، بۆم بلێ :

موعاذ زۆری پێ خۆش بوو هەلێکی دەست کەوێ تا هەندێ لە فەرمایشتی خوای پەروەردگار بدات بە گوێی باوکیا تا بەشکوم دڵی نەرم بێ و بێتە سەر راستە شەقام .. جا کە باوکی داوای لێ کرد بە بێ وەستان دەستی کرد بە خوێندنی سوورەتی « الفاتحة » تا کۆیابی پێ هێنا ..

عەمر بە جوانی گوێی گرت بۆ خوێندنی کوڕەکەی .. سەرنجی دا ئەم وتەیە لە توانای ئادەمیزادا نیە بیلێ بۆیە وتی :

ئای چ وتەیەکی چاك و جوانە !
ئایا هەموو وتەکانی وەك ئەمەن ؟
موعاذ وتی : بەڵێ بابە گیان لەمەش چاکترن ، ئایا ئەتەوێ تۆش پەیمانی بدەیتێ ؟ خۆ هەموو خزمەکانت پەیمانیان داوەتێ ..

عەمر کەمێك بێدەنگ بوو و ئینجا وتی :
نەخەیر ، پەیمانی نادەمێ هەتا پرس بە « مەنات » نەکەم ، با بزانم چی ئەڵێت :
کوڕەکەی هەلی بۆ هەڵ کەوت تا پلارێ بگرێتە مەناتی کەڕ و کوێر و بۆ باوکی دەرخا تازە ئیتر مێشکە پاکە ناسکەکان خۆشەویستیی هیچ بتێك ناچێتە دڵیانەوە و ڕێگەی ڕاستیان دۆزیوەتەوە .. ڕێگەی خواناسیی .. ڕێگەی سەرفرازیی ئەم ژیانە و ڕێگەی بەهەشتی نەبڕاوە، بۆیە وتی :

جا بابە گیان ، مەنات کە بریتیی بێ لە تەختەیەکی کەڕ و لاڵی نەزان ئەبێ چی بڵێ و چیت وەڵام بداتەوە ؟
ئەم وتەیەی موعاذ دای لە دەماخی باوکە پیرەکەی

و تووڕەی کرد ، بە تووڕەییەکەوە وتی : پێم وتی : بێ ئەو پەنجە بـە خۆڵا ناکەم ..

شیرینیی و بە تامیی ئەو سـوورەتەی کـە موعـاذ خوێندی لـە لایەکەوە و هێرش بردنی بۆ سـەر وزە و دەسەڵاتی مەنات لـە لایەکی ترەوە ، عەمری پاڵ پێوە نـا تـا هەڵ سێتەوە بۆ لای بتەکەی تا پرس و رای پێ بکا..

جا بۆ خۆ خەڵەتاندن هەر کاتێ بیان ویستایە پرس بـە بتێك بکەن پیرەژنێکیان لـە دوای بتەکەوە ئەوەستاند و کە پرسیاریان لێ ئەکـرد پیرەژنەکە هـەر وەڵامێکی بدایەتەوە لێیـان وەر ئەگرت ..

سادەیی و خۆخەڵەتاندن تا ئەو رادەیـە .. ئـەیان زانی بتەکە قسە ناکات کەچی پرسیان پێ ئەکرد .. لێی ئەلالانەوە ..

بـە لامانەوە سەیرە ئەوانە چۆن مرۆڤێك بوون ، تا ئەو رادەیە ئامادە بوو بن خۆیان بخەڵەتێنن.. بەڵام دەی بـا ئێمەش خۆمان نەخەڵەتێنین .. با وا نـەزانین هـەر ئەوان بتیان پەرستووە و خۆیانیان خەڵەتاندووە ..

ئەوەی راستیی بێ ـ وەك لە پێشەوە وتمان ـ جگە لـە خواناسان ، هەموو مرۆڤێك بتپەرستە .. وە جگـە لە خواناسان هەرچی مرۆڤ هەیە خۆی ئەخەڵەتێنێ ..

گوایا مرۆڤی سەرگەردانـی ئـەمڕۆ کە شـەیدای بیروبـاوەڕی کافـران بووە ، نازانـێ چ رۆژئـاوا و چ رۆژهـەڵات چـۆن خـوێن مژێـکی بـێویژدانـن بۆ مرۆڤایەتیی ؟!

گوایە نازانێ رێبازی خوانەناسیی لـە سـەر درۆ و پاکانده و حەرامخواردن و کوشت و بڕ و بێوەفایی و نامەردیی وەستاوە ؟!

گوایە نازانێ بەرزکردنەوەی ئاڵای بێڕەوشتیی چ سووکیی و ریسوایيەکی وا بە شوێنەوە ؟!

گوایە نازانێ رووتکردنەوەی کچەکەی بریتییـە لـە داماڵینی شەرەف و حەیای ؟!

گوایـە ......

ئەی بۆچ خۆی ئەخەڵەتێنێ ؟

تەنها لە بەر ئەوەی بتپەرستە و ڕێبازی خواناسیی نەدۆزیوەتەوە !!

کە ئەڵێ : پێش کەوتن ، ئەزانێ گەڕانەیەوە بەرەو ژیانی ئاژەڵیی ..

کە ئەڵێ : ڕزگاربی ، ئەزانێ نۆکەریە ..

کە ئەڵێ : ماف ، ئەزانێ دەست بڕینە ..

وە کە ئەڵێ : میللەت ، ئەزانێ گاڵتەپێ کردنە ..

عەمری داماوی دەست و پێ کۆت کراو بە کۆت و زنجیری نەفامیی ، دڵی نەئەهات دەست لە مەنات هەڵ گرێ ، ئەگەرچی ئەیزانیی تەختەیەکە و بە دەستی خۆی بۆنی خۆش ئەکات ..

لە گەڵ ئەمەشا هەڵسایەوە و بە شەلە شەل هاتە بەردەمی و خۆی دا بە سەر قاچە ساغەکەیدا و بە بالاّ بەرزەکەیەوە قنج ڕاوەستا و دەستی دایە سوپاس و ستایشی مەنات .. مەناتیش ورتەی لێوە نەئەهات ، ئینجا وتی :

ئەی مەنات ، بێ گومان زانیوتە کەوا ئەو بانگ کەرەی

که له مه‌ککه‌وه هاتۆته ناومان ، خراپه‌ی بۆ که‌س ناوێ جگـه له تۆ •• وه به راستیی ئـه‌و بۆ ئـه‌وه هاتـووه دووره‌پـه‌رێزییمان بکا لـه په‌رستنت ، وه منیش پێم ناخۆش بوو په‌یمانی بده‌مێ ـ ئه‌گه‌ر چی ئه‌وه‌یش که لێم بیستووه زۆر جوان و رێك و پێکه ـ هه‌تا پرسـت پێ نه‌که‌م ، جا تویش رێگه‌م بۆ دانێ ••

مه‌نات وه‌ڵامی نه‌بوو ••

وتی : له‌وه ئه‌چێ تووڕه بوو بیت ، بـه‌ڵام خـۆ هێشتا من کارێکم نه‌کردووه زیانی بۆ تۆ هه‌بێ •• به‌ڵام قه‌یـدی نیـه •• تا چـه‌ند رۆژێ وازت لـێ دێنـم تـا تووڕه‌دییه‌که‌ت بنیشێته‌وه ! •

به‌ڵێ، بت‌په‌رستیی سه‌رلێ‌شێواوییه‌کی بێ‌ئه‌ندازه‌یه•• ته‌نها ئه‌وانه‌ش هه‌ستی پێ ئه‌که‌ن که له داو و ته‌ڵه‌کانی رزگاریان بووه •• وه ته‌نها ئه‌وانه‌ش ئه‌توانن خۆیان لـه داوی دا ماڵن که ئاماده‌ن خۆیان نه‌خه‌ڵه‌تێنن !

## (٢)

کوڕەکانی عەمر بۆیان دەر کەوت خۆشەویستیی مەنات بە تەواوەتیی لە کرۆکی دڵی باوکیانا جێگیر بووە .. وە ئەوەندە دڵی وابەستەی بووە ، بووەتە پارچەیەك لە لاشەی .. ئادەمیرادە و خۆشەویستی راستەقینەی دەست ناکەوێ و ناچارە بە هەر شتێ بێ ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە .. پێشمینە راستیان وتووە : شەڕ لە بەتاڵیی چاکترە ، چونکە ئادەمیزاد ناتوانێ لە بۆشاییدا ژیان بداتە سەر ، بۆیە پێویستە خەریکی شتێك بێت و دڵی پێ خۆش کا و فێنکیی بخاتە دڵیەوە ..

بەڵێ کوڕەکان لە پاڵ ئەمەدا بۆشیان دەر کەوت بیروباوەڕی باوکیان لەق بووە .. لە لایەکەوە سەیری دەور و بەری ئەکا ئەبینێ وا هەموویان پشتیان لە بتپەرستیی هەڵ کرد ، وە وا پرسیاریشی لە مەنات کرد و وەڵامی نەبوو ، کەواتە کاتی هاتووە بە یەکجاریی لە بەر چاوی بخەن ، تا بەشکوم ئیمان بێنێ و بکەوێتە

گەل کاروانی بەختەوەران ..

بۆ ئەمە کەوتنە را و تەگبیر تا بە هەر شێوەیەك بووە لە داوی مەنات رزگاری کەن ..

کوڕەکان هەر سێکیان لەگەڵ موعاذی کوڕی جەبەلدا شەو تەپیان کوتایە سەر مەنات .. هەڵیان کرت و بردیان خستیانە چاڵێکەوە کە نەوەی سەلیمە زبڵ و شتی فڕێدراویان تێ ئەخست .. فڕێیان دایە ناو چاڵەکەوە و بێ چربە گەڕانەوە ماڵەوە بێ ئەوەی کەس پێیان بزانێ ..

بۆ بەیانیی عەمر کە لە خەو هەڵسا بە نەرمیی و لە سەر خۆوە بەرەو بتەکەی کەوتە رێ ، تا سڵاوی لێ بکا .. سەیری کرد لە شوێنی خۆیا نەماوە .. رووی کردە ئەندامانی خێزان و وتی :

تیاچن ، ئەوە کێ ئەمشەو دەستی لە خواکەمان وەشاندووە ؟ ..

هیچکامیان بە هیچ شێوەیەك وەڵامی نەدایەوە ..

ناچار بوو خۆی بە تەنیا لە ناو و دەرەوەی ماڵەکەدا

بۆی بگەڕێ ، چونکە بۆی دەرکەوت لە ماڵەکەدا تەنها خۆی لە سەر ئایینی کۆن ماوەتەوە .. بەڵام لە بەر وەبەرزیی و کوڵنەدانی باکی نەبوو .. زۆر گەڕا بۆی.. تەواو تەواو پەست و تووڕە بوو بوو..دەروونی کەف و کوڵی بوو و هەڕەشەی ئەکرد لەو کەسەی بتەکەی لێ شاریوەتەوە .. سەرەنجام دۆزیەوە ، سەیر ئەکا وا لە ناو چاڵێکاو دەمە و نخون بووە .. هێنایەوە بۆ ماڵەوە پاك شۆریی و ئەوسا بۆن خۆشیی پیا کرد و لە جێگاکەی جارانیا دانایەوە و بەم شێوەیە کەوتە گفت و گۆ لە گەڵیا :

بەڵام بە خوا ئەگەر ئەم زانیی کێ وای پێ کردووی سەرشۆڕم ئەکرد ..

عەمر بۆی دەرکەوت هێزی خواکەی چەندە ، بەڵام هێشتا دڵی پێ خۆش ئەکرد و خۆی ئەخەڵەتاند بۆی ..

لە سەر زەویی ئەمڕۆدا ئەگەر کەمێ بە وردیی سەرنج بدەین سەیر ئەکەین زۆربەی بتپەرستان چاك حاڵیان بووە بتەکانیان هیچیان تیا بەستە نیە و

بیروباوەڕەکانیان تلپی تەڕیـان تیا نەماوە و بـە فوویـەك بەندن ، کەچی عەمر ئاسایی،بە بێ وەستان هەر خەریکی باگانـدەن و ئەیانەوێ بـە گاڵـە کۆمـەڵ لـە دەوری بیروباوەڕی پووچەڵ کۆ بکەنەوە !!

بۆ شەوی دووەم گەنجەکان هێرشیان بردەوە سەر مەناتی تەختەرەق و وەك دوێشەویان پێ کردەوە .. بۆ بەیانیی باوکی پیریان سەیری کرد بتەکە لە شوێنی خۆیا نەماوە .. کەوتەوە گەڕان بـە دوایا تـا لە چاڵـەکـەدا دۆزیەوە و لـە لیتـە و پیسایی هەڵ کێشرا بوو ، هەلی گرت و ئەمجاریش شۆردیەوە و دوای بۆنخۆش کردنی لـە شوێنەکەی خۆیا دای نایەوە ..

گەنجەکان هەروا خەریکی فڕێدانی مەنات بوون و باوکەش کون و قوژبنی بۆ ئەگەڕا و ئەیدۆزیەوە ، تا تەنگی پێ هەڵ چنرا و بێزار بوو ، لە داخانا شەوێکیان بەر لەوەی بخەوێ چوو بۆ لای و شمشێرەکەی خـۆی هێنـا و کردیە ملی و پێی وت :

ئەی مەنات ، بە خوا من نازانم کێیە ئەمـەت بـێ

ئەکات کە ئەی بینی ! جا ئەگەر هیچت لــە دەست دێ ، بەرگریی لە خۆت بکە و ئەوەتا شمشێر لــە ملتا ••

ئەمەی وت و چوو ێیی خەوت ••

گەنجەکان چاویان لە باوکیان بوو ، دەنگیان نەکرد تا پرخەی دا لە خەو و ئەوسا دایان بە ســەر بتەکـەدا و شمشێرەکەیان لە ملی داماڵیی و لە ماڵ بردیانە دەرەوە و بە پەتێك بەستنیان بە لاکی سەگێکی تۆپیوەوە و خستیانە ناو کۆنە بیرێــکەوە کە شــوێنی کۆبوونــەوەی زبڵ و پیسایی بوو ، تــا ئیتر ئەمجارەیان باوکیان بێزی نەیەت هەڵی گرێتەوە ••

کە باوکیان لە خەو هەڵسا بــە تەما نەبوو مەنات نەما بێ ، سەیری کرد وا دیسان نەماوە •• دەســتی دایــەوە گەڕان بە شوێنیا ، لە بیرەکەدا دۆزییەوە ، کە بەو حاڵەوە بینی ئیتر بە یەکجاریی لــە بەر چاوی کەوت و دەســتی لــێ هەڵ گرت و موسڵمان بوو ••

## (٣)

عەمری کوڕی جەمووح بە یارمەتیی و پشتیوانیی خوای گەورە رووی کردە ڕێبازی پیاوچاکان.. دڵەکەی پڕ بوو لە ئیمان .. شیرینیی ئیمانی چەشت .. تێ گەیشت ئەم ڕێبازە لە کوێ و ڕێبازی سەرلێشێواویی لە کوێ ؟ ئەم ژیانە لە کوێ و ژیانی ئاژەڵیی سایەی نەفامیی لە کوێ ؟

تا تامی ئیمانی نەکرد بوو ژیانی بتپەرستیی نەئەزانی .. نەی ئەزانی دڵەکەی بە چ خۆشەویستییەك پڕ کات .. بۆیە کە تێ گەیشت ، پەنجەی پەشیمانیی گەستەوە .. چۆن ئەم هەموو ماوەیە ئیسلام لە دەور و بەریا بووە و ئەو دڵی بۆی نەکراوەتەوە ؟

پەشیمان بوو لەو تەمەنەی کە بە بتپەرستیی بە سەری بردووە .. بۆیە بە هەموو ئەندامێك و بە دڵ و بە گیانیەوە رووی کردە خوا .. خۆی و ماڵ و سامانی

خسنه ئەو لاوە بۆ بە گوێ کردن و مل کەچیی کـردن بۆ خوا و پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی ..

عەمر دوا ئەنصاریی بوو موسڵمان بێ .. جادوای موسڵمان بوونی ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ـ صلی اللـه علیه وسلم ـ لە نەوەی سەلیمەی پرسیی :

کێ سەردارتانە ئەی نەوەی سەلیمە ؟

وتیان : جەددی کوڕی قەیس[1] ، بەڵام ئێمە بـە رژدی ئەزانین .. پێغەمبەری خـوا ـ صـلی اللـه علیه وسلم ـ دەستی سەرسوڕمانی با دا و فەرمووی : جـا چ دەردێك بە قـەد دەردی رژدیی کـاریـگەرە ؟ بەڵـکو سەردارتـان عەمری کوڕی جەموحە[2] ..

---

(١) ئەو مونافیقەیە کە لە کاتی پەیمانی ریضواندا لە ژێر سکی وشترەکەیدا خۆی شاردبۆوە .. هەتا دوای مردنی ئـــەوە بوو ئـەبووقەتادەی خــزمی نوێژی لە سەر نەکرد ، لە سەر ئەو وتانەی کە لە رۆژی حودەیبییەداهاتبوون بە دەمیا .

(٢) دوای شەهیدبوونی عــەمری کــوڕی جــەمووح ، پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ بیشری کوڕی بەڕائی کردە سەرداری نەوەی سەلیمە ..

عەمر سنگ‌فراوان بوو ، بۆیە پێغەمبەری خـوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ کە ژنێکی بهێنایە عەمر خواردنی بۆ ئەکردن و بانگی ئەکردن ..

ئەوەندەی پێ نەچوو جەنگی ئوحود هاتە بەرەوە ، سەیری کرد وا هەر سێ کوڕەکەی خۆیان ئەپێچنەوە و پێویستیی جەنگ ئامادە ئەکەن تا بچن بە گژ دوژمنانـی خوادا(۳) ..

سەیری کرد کوڕەکان ئامادەیەکی تەواویان هەیە بۆ ئەوەی بەژداریی جەنـگ بکەن و لـە بـەر دەسـتی پێغەمبەری پێشەوادا لەگەڵ کافراندا بجەنگێن .. وەکـو شێری بێشە هەر ئەمسەر و ئەوسەریان ئەکرد.. پەلەیان بوو بگەنە مەیدانی شـەهیـدیی .. مەیدانـی مـەرد و قارەمانـان .. دڵیـان گـڕی گرتبوو بۆ شـەهیدیی و وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی پەروەردگار .. ئەمیش دڵی گەرم بوو و لێ بڕا بۆ ئەوەی بەژداریان لەگەڵا بکات..

---

(۳) هەر سێکیان ـ خوا لێیان رازیی بێت ـ بەژداریی جەنگی بەدریان کردووە ..

بڕیاری دا ئەمیش وەك ئــەوان ـ بەڵــكو زیاتر ـ ئامادەی شەهیدبی بێت •• بەڵام كوڕەكانی پێیان ناخۆش بوو ، بۆیە تەگبیریان كرد بە هەر شێوەیەك بووە بەشكوم نــەهێڵن باوكیان بێتــە مەیدانی جەنگــەوە •• چونكــە پیاوێكی یەكجار پیر و بە ساڵا چووە ، لــە پاڵ ئەمەشــا شەلە بــە شێوەیەك ناڕەحەت ئەتوانێ بچێ بــە رێوە ، وە خوای گەورەش ئەركی جیهادی لــە سەر شــانی لا بردووە • وتیان :

بابە گیان ، خوای ئەوەرە چاوپۆشیی لە تۆ كردووە ، جا بۆچ خۆت تووشی ئەركێ ئەكەی كە خوا چاوپۆشیی لــێ كردوویت ؟

باوكیان لــە وتەكەیان زۆر زۆر تووڕە بوو ، بۆیە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسـلم ـ و وتی :

ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەم كوڕانەم ئەیانەوێ لــەم خەیر و چاكەیە بێبەشم بكەن ، بیانووشیان ئەوەیە مــن شەلم •• دە بە خوا هیوادارم بەم قاچە شەلەمەوە بچمــە بەهەشتەوە ••

کە پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - دڵسۆزیی و دڵگەرمیی عەمری بینی ، دڵی بۆی سووتا بۆیە بە کوڕەکانی فەرموو :

وازی لێ بێنن ، بەشکوم خوای گەورە شەهیدیی خەڵات کات ..

ئیتر کوڕەکانی ، بۆ گوێڕایەڵیی پێغەمبەری خوا ، وازیان لێ هێنا ...

لەشکری موسڵمان خۆی پێچایەوە تا ددر چن بۆ دەشت و جەنگ لە ناو شار دوور کەوێتەوە و موسڵمانەکان ماوەی جەنگ کردنیان هەبێت ، جا کە کاتی دەرچوونیان هات عەمری کوڕی جەمووح خواحافیزیی یەکجاریی لە ژنەکەی کرد .. خوا حافیزییەك کە بە تەمای گەڕانەوە نەبێت ..

سەربازی بەوەفای قورئان دڵی بە باشیی کردبوویەوە تا بە ڕۆشنایی قورئان پڕی کات و زاخاوی بدات ، بۆیە ئەوەندەش حەزی لە جیهاد و لە شەهیدیی بوو .. بە راستیی و بە نیەتێکی تەواوەوە خۆی فرۆشتبوو بە خوا..

بۆی دەرکەوتبوو ژیانی ئـەم دنیا هیچی تیا بەسـتە نیە و درەنگ بێ یان زوو هـەر تەواو ئـەبێت . جا حـەیفە موسڵمان لـە پێناوی خوادا دای نەنێت ..

دوای خواحافیزیی رووی کـردە کـەعبەی پیـرۆز و هەردوو دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و وتی :

خوایە شەهیدیم خەڵات کەیت و بە دەستی بەتاڵ و بـە دۆڕاویی نەمگێڕیتەوە بۆ ناو کەس و کارم .

خوایـە شەهیدیی ..

ئەمەیە ئاواتی ئەوانەی ، بۆ خوا بەژداریی جیهادی ئیسلامیی ئەکەن ..

ئەمەیە سروودی ڕێگای جیهادیان ..

شەهیدیی .. ڕەزامەندیی خوا .. بەهەشتی پـڕ ناز و نیعمەت ..

دیارە هەر کۆمەڵێ ئەو گیانەیان تیا ڕوا ، شـایانی خوای گەورە سەربەرزیی هـەردووجیهانیـان خـەڵات کـات ..

عەمر کەوتە ڕێ و پشـتی بـە خوا بەست تـا بـە

ئاواتی بگەیەنێ •• هەرسێ کوڕەکەی و کۆمەڵێکی زۆر لــە نەوەی سەلیمە لــە خزمەکانی بــە دەوریا بوون ••

جەنگ گەرم بوو و تیراندازەکان هەڵەکەیان لــە دەست دەرچوو و موسڵمانەکان شپرزە بوون •• ئــا لەو کاتانەدا پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ موسڵمانی کەم بــە دەوریا مابوون ، ئەوانی تر پەشۆکا بوون و هەر یەکە بــە لایــەکا پژا بوون •• کەچی عــەمری کوڕی جەموح لەگەڵ خەڵادی کوڕیا لــە خزمەتی پێغەمبەری خوادا مابوونەوە •• بە هەموو لایەکا هــەڵمەتیان ئەدا و بــەرگــریان لــە پێغــەمبەری خــوا ئەکــرد و هێرشی کافرانیان ئەگێڕایە دواوە •• عەمر بە هەموو بارێکا هەڵ ئەسووڕا • جا بۆ ئەوەی هەڵمەتی پێ ببرێ بــە ســـەر قاچە ساغەکەیەوە هەڵ ئەبەزی و هەموو جارێ هاواری ئەکــرد :

بەراستیی دڵم گڕی گرتووە بۆ بەهەشت !
بــە راستیی دڵم گڕی گرتووە بۆ بەهەشت !

هەڵمەتی ئەدا و خەللادی کوڕیشی بە دوایەوە بوو .

خوا لێیان رازیی بێت هەروا خەریکی بەرگریی بوون ئەچوون بە گژ کافراندا تا هەردووکیان بە شەهیدیی سەریان نایەوە کە تەنها چەند سانێك پێش و پاش کەوتن ..

مەیدانی جەنگیان بە خوێنە گەشەکەیان سوور کرد تا بیسەلمێنن خواناسان شەیدای قوربانییدان لە پێناوی خوادا .. شانازیی پێوە ئەکەن لە پێناوی بیروباوەڕدا سەر بنێنەوە .. ئەوپەڕی سەربەرزییە بۆیان شەهیدیان خەڵات کرێ(٤) ..

کە جەنگ کۆتایی هات موسڵمانەکان دەستیان گرت بە سەر مەیدانی جەنگا و شەهیدەکانیان کۆ کردەوە و پێغەمبەری خوا ـ صلی اللە علیه وسلم ـ

---

(٤) ئەبوو ئەیمەنی خزمەتگوزاری عەمریش لەم جەنگەدا بەژداریی کرد و ئەویش بە شەهیدیی سەری نایەوە .

شـــایەتیی بۆ دان کـە ئـەوانە شـەهیدن و فەرمانی دا عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرام و عەمری کوڕی جەمووح ، کە مێردی خوشکی عەبدوڵڵا بوو ، پێـکەوە بخرێنـە گۆڕێکەوە(٥) ..

جابیری کوڕی عەبدوڵـڵا ڕووداوێك ئەگێڕێتەوە کە دوای چل و شەش ساڵ موعاویە ئەیەوێ لـە پـاڵ شەهیدەکانی ئوحودا بیر هەڵ کەنێ ، ئەڵێ : لە پاڵیانا چاڵمان هەڵ ئەکەند ، چاوم کەوت بە باوکم لە گۆڕەکەیا هەر بە شێوەی خۆی بوو وەك خەوی پیا کەوتبێ ، وە عەمری کوڕی جەمووحی هـاوەڵیمان لـە گۆڕەکـەیدا بینی و دەستی بـە سەر زامەکەیەوە بوو کە دەستیان لا دا زامـەکـەی خوێنی لـێ ئەڕۆێشـت .. وە ئـەڵێن : گۆڕەکەیان وەك بۆنی میسکی لێ بەرز ئەبوویەوە ..

خوا لێیان رازیی بێت .

---

(٥) ئەوە بوو چۆنیەتیی هێنانەوەی لاشەی عەمر و عەبدوڵلا و خەللاد لـە لایەن هیندەوە لـە باسـی عەبدوڵلای کوڕی عەمردا باس کرا ..

# سەرچاوەکان


١ ـ الاستيعاب ـ ابن عبدالبر
٢ ـ اسد الغابة ـ ابن الاثير
٣ ـ الاصابة ـ ابن حجر العسقلانى
٤ ـ ان الله اشترى ـ احمد الشرباصى
٥ ـ التاج ـ منصور على ناصف
٦ ـ حلية الاولياء ـ الاصبهانى
٧ ـ حياة الصحابة ـ الكاندهلوى
٨ ـ الرسول ـ سعيد حوى
٩ ـ الرسول في قلوب اصحابه ـ وليد الاعظمى
١٠ـ الرسول القائد ـ محمود شيت خطاب
١١ـ رياض الصالحين ـ النووى
١٢ـ السيرة النبوية ـ ابن كثير الكردي
١٣ـ السيرة النبوية ـ ابن هشام
١٤ـ صفة الصفوة ـ ابن الجوزى

١٥- صور من حياة الصحابة - عبدالرحمن رأفت الباشا
١٦- غزوات الرسول وسراياه - ابن سعد
١٧- غزوة أحد - محمد احمد باشميل
١٨- غزوة بدر - محمد احمد باشميل
١٩- فدائيون - احمد الشرباصى
٢٠- القصص الاسلامية - احمد بن حافظ الحكمى

# ئەم نامیلکەیە

هەڵوێستی بەرز و پیرۆزی چەند شەهیدێك پێش چاو ئەخات ، تا سەرمەشق بێ بۆ هەڵگرانی قورئان و بزانن ئاینی ئیسلام بەو جۆرە پیاوانە سەرانسەری سەرزەویی رۆشن کردۆتەوە ، وە تا ئەم گیانە نەبەزە ، کە هەموو ئاواتێکی شەهیدبوون بێت ، لە موسڵمانەکانی ئەم چەرخەشدا نەڕوێ ، ئادەمیزاد ناکەوێتەوە رۆشنایی و لە ستەم و جەور رزگاری نابێت ..

نرخی ٦٠٠ فلسە